# نووسینەوەی فەرموودە

## لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیدا


نووسینی

ئەحمەد مەلا فائق سعید



مكتبة صلاح الدين

للنشر والتوزيع



# نووسینەوەی فەرموودە

لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانیدا


ناوی کتێب: نووسینەوەی فەرموودە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیدا

نووسینی: أحمد ملا فائق سعيد

ژمارەی لاپەڕە: ٢١٠ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٧ X ٢٤ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٥٥) ی ساڵی ٢٠١٧ ی زایینی پێدراوە



چاپی یەکەم

١٤٣٨ هـ




کتێبخانەی صلاح الدين

هەولێر | فلکەی شێخ محمود | باڵەخانەی سید بهاء الدین

٠٦٦٢٢٥٤٠٢٧٦




نووسینی

أحمد ملا فائق سعيد

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع




أحمد ملا فائق سعيد

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء: ١].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

**«أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»**[1].

وَبَعْدُ:

**هەر لە سەرەتای دابەزینی وەحی و بوون بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ دژایەتی و ئازارەکان بۆ پێغەمبەری ئیسلام لە ئاستێکی سەرەتاییەوە دەستی پێکرد، بە زیاتر دەرکەوتن و ئاشنابوونی خەڵکی بە سیفەتە بەرز و کامڵەکانی (محمد) ﷺ و پێغەمبەرایەتییەکەی؛ زیاتر ئاستی دژایەتی و**

(١) أخرجه مسلم (٨٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وابن ماجه (٤٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥)، وأحمد في "المسند" (١٤٩٨٤)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٣١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٥٨٠٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤)، والمروزي في "السنة" (٧٣)، وغيرهم، وانظر "خطبة الحاجة" للألباني.

توانج و ڕەخنە و دۆزینەوەی بەهانە بۆ باوەڕپێنەبوونی و شوێننەکەوتنی و پەکخستنی بانگەوازییەکەی دەبیسترا، هەرجارەی بە ناوێك، کە ساحیرە، یاخود شاعیرە، ... .

وە لە قۆناغی مەدینەشدا دووڕووەکان و جوولەکەکان کاری شەو و ڕۆژیان کۆسپ دروستکردن و سەرقاڵکردنی بوو بە ڕووداوەکانەوە، تاوەکوو لە بازنەیەکی دیاریکراودا بمێنێتەوە و نەناسرێت.

بەڵام بە وادەی خوایی کە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨﴾ [الصَّف :٨]. هەر دەبێت نوورەکەی تەواو بێت، ئەو کۆسپە دەرەکیانە کۆتایی پێهات و ئیسلام بڵاو بووەوە بە جیهاندا.

بۆیە لەدوای بوونی ڕێژەیەکی زۆری هاوەڵان بە هەموو سیفاتە بەهاکانی شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی و پەیوەستبوون پێوەی، وە لەبەرکردن و نووسینەوە و گەیاندنی فەرموودە و کردەوەکانی و بڵاوکردنەوەی، کاری بەردەوامی دینداریيان بوو.

لە کۆتایی ئەم چینەشدا، جۆرێك لە جۆرەکانی غەریبی سوننەت و پەیوەستنەبوون بە پێغەمبەرەوە ﷺ دروست بوو و سەری هەڵدا لەناو دۆستاندا بە بەرگێکی دینداری، جارێك بەناوی ئەوەی کە قورئان بەسە بۆ کارپێکردن و پێویست بە هیچ ڕیوایەت و فەرموودەیەك ناکات، وەکوو ئەوەی هەموویان پێغەمبەر ئاسا بن لە وەرگرتن و تێگەیشتنی قورئاندا و نێوانی ئەوان و (جبریل) ﵇ کەسی نەوێت، وەکوو خەوارجەکان و موعتەزیلەکان ... .

وە لەلایەکی تریشەوە بەهەڵزانینی ڕووداو و تاقیکردنەوە و قەدەرەکانی خوا بەسەر هاوەڵاندا و کردنە هۆکاری ئەوەی کەسی دادوەر نەما بۆ گواستنەوەی فەرموودەکان و ڕێگە پچڕا لەنێوان ئێمە و پێغەمبەردا ﷺ، ئەمەشیان کردە ڕێگایەکی تر بۆ خۆڕزگارکردنیان لە فەرموودە و ڕیوایەتەکان، وەکوو ڕافیزەکان و خەوارجەکان.

وە دیسان لەلایەکی تریشەوە هەبوونی نیەتی پێشوەختە بۆ کارنەکردن بە فەرموودە و خۆدزینەوە لە شوێنکەتەیی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، هاتن دەستیان کرد بە گەورەکردنی عەقڵ و بیروڕاکان و دەسەڵات و پلە دانانێك بۆی، کە مەرجی وەرگرتنی هەموو کار و بیروڕایەکیان پێوە پەیوەست کرد، توانا و هێزێکیان پێبەخشی تا وەکوو (آلهة) و خواوەندێکی پەرستراوی لێهات

لەناو بازنەی خواپەرستیدا و بە ئاشکرا ئایەت و فەرموودەکانیان خستە ژێر باری یاساکانی عەقڵەوە، وەکوو فیرەقە عەقلانییەکان.

تا گەیشتە ئاستی ئەوەی لەلایەن ناودارەکانیانەوە بیرۆکە و تۆمەت دروستکرا، وەکوو هۆکاری ڕزگاربوون لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و فەرموودە و ڕێگە پڕ هیدایەتەکەی، وەکوو (نظام وجاحظ وعمرو بن عبید وواصل ...)، هەرجارەی بە ناوێکەوە، جارێك بەناوی ئەوەی کە فەرموودە نەنووسراوەتەوە و جارێك بەناوی ئەوەی ئەمە بەڵگەیەکی گوماناوییە (ظني الدلالة) و بەڵکوو پێویستی بەوەیە ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ بخرێتە ژێر باری «یفید العلم النظري؛ أي العلم المتوقف على النظر والاستدلال»[1].

واتە: تێڕوانینێکی بیرکردنەوە و بەڵگەکاری بۆی، وە بە کەس و بەرنامەی خۆیشیانەوە ئەم ڕێگەیەی بۆ ئەنجام بدرێت.

هەموو هۆکارەکانیش ئاشکرایە کە دڵنیانەبوونە لە پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی و نیەت و مەبەستبوونە لە وەرنەگرتن و خۆنەدانەدەستی ئیسلام، لەبەرئەوەی ڕێژەی زۆری ووردەکاری و تەواوبوونی دینداری لە سوننەتدایە، بۆیە ڕزگاربوون لە سوننەت ڕزگاربوونە لە قورسایی ئیسلام.

تا لەم دواییەدا دوژمنانی ئیسلام بەناوی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (المستشرقين) کە: «أنَّ المُسْتَشْرِقِينَ فِي جُمْهُورِهِم لا يخلو أحدهم من أنْ يَكون قِسِّيساً أو استِعْمارِيّاً أو يَهودِيّاً»[2]. زۆریان یا قەشەن، یاخود جوولەکەن یان داگیرکەرانن.

ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە سوودمەند بوون لە قسە و گومان و هەڵوێستی فیرەقەکان و نووسراوەکانیان، بە هەمان ڕێچکە و بەرنامەی ئەوان توانج و ڕەخنەکانیان زیندوو کردووەتەوە بە بەرگی دارشتنی خۆیان، وەکوو (جولد تسیهر)ی جوولەکە، کە نووسەرە میسرییەکانی وەکوو (أبو رية وأحمد أمين وعلي حسن عبد القادر ...) زۆری قسە و بیرۆکەکانیان لەوانەوە گواستووەتەوە، بەتایبەت لە کتێبەکەی بەناوی "العقيدة والشريعة" کە بە سەرپەرشتی (طه حسين)

---

(١) "تيسير مصطلح الحديث" لمحمود طحان النعيمي ص٢٧.

(٢) "الاستشراق والمُسْتَشْرِقُونَ ما لهم وما عليهم" لمصطفى السباعي ص٧٣.

وەرگێڕدرا و چاپ کرا لە (دار الكتب المصرية)[(١)].

وە كتێبى "الدراسات الإسلامية" كە ساڵى (١٩٨٠) بڵاو كرايەوە[(٢)].

وە هەروەها وەكوو (هربلو الفرنسي وكاتيان وشبرنجر ومرجليوث وشاخت وجبت)[(٣)]، كە (مصطفى السباعي) ڕەخنەيەكى زۆريان لێدەگرێت و ڕوونى دەكاتەوە كە كارەكانيان لە چوارچێوەى ناشرينكردنى ئيسلام و دوژمنكارى دەرناچێت، بە ڕێگەى گۆڕينى دەق و قسە و وەرگرتنى بابەتەكان لە سەرچاوەكانى كتێبى ئەدەب و حيكايات و چيرۆك و بەسەرهاتەكانەوە، كە بۆخۆى سەرچاوەى ئەو بابەتانە نين، وەكوو: "الشعر والشعراء" و "ثمار القلوب في المضاف والمنسوب" و "مقامات بديع الزمان الهمذاني" و "المثل السائر" و "شرح نهج البلاغة" و "حياة الحيوان" للدميري و "نهاية الأرب" ونحوها[(٤)]، وكتاب "ألف ليلة وليلة" و "العقد الفريد"، أو "الأغاني" أو غيرها من كتب الأدب[(٥)].

بەڵام (بوخارى و مسلم و موطأ و أبو داود ...) بەدرۆ دەخەنەوە، كە ئەمانە سەرچاوەى دروستى خۆين.

بەڵام ئەوەندەى دۆستێكى نەزان زيان دەگەيەنێت و دوژمن سوودمەندە لێى؛ دوژمنێكى بەهێز نايگەيەنێت، وە بەتايبەت ئەمڕۆ كە: «كل سفارة من سفارات الدول الغربية لدى هذه الدول سكرتير أو ملحق ثقافي يحسن اللغة العربية، ليتمكَّن من الاتصال برجال الفكر والصحافة والسياسة فيتعرَّف إلى أفكارهم، ويبث فيهم من الاتجاهات السياسية ما تريده دولته»[(٦)].

---

(١) "السُنَّة في مواجهة شُبُهات الاستشراق" لأنور الجندي ص١١، و "موقف الاستشراق من السُنَّة والسيرة النبوية" لأكرم العمري ص٧٠.

(٢) "السنة في مواجهة الأباطيل" لمحمد طاهر حكيم ص٣٨.

(٣) "السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي" لمصطفى السباعي ص١٥، و "موقف الاستشراق من السُنَّة والسيرة النبوية" لأكرم العمري ص٧٠.

(٤) "دفاع عن السُنَّة ورد شبه المُسْتَشْرِقِينَ والكتاب المعاصرين" لمحمد أبو شهبة ص١١٤.

(٥) "السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي" لمصطفى السباعي ص٢٣٥.

(٦) "الاستشراق والمُسْتَشْرِقُونَ ما لهم وما عليهم" لمصطفى السباعي ص٢٤.

لە سەفارەتە ئەوروپییەکاندا کەسی تایبەت دادەنێن بۆ پەیوەندیکردن بە نووسەران و خاوەن فیکر و سیاسەت و ئەوەی کە دەیانەوێن پێیانی دەگەیەنن.

وە هەموو کاری ئەمان و ڕۆژهەڵاتناسەکان لە ناخدا دژایەتیکردنی ئەم دینەیە، وەکوو فەیلەسووفی موسوڵمانی فەڕەنسی (إتيان دينيه) دەربارەی ناخی کارکردنیان دەڵێت: «إِنَّهُ مِنَ العَسِيرِ أَنْ يَتَجَرَّدَ الْمُسْتَشْرِقُونَ مِنْ عَوَاطِفِهِمْ وَنَزَعَاتِهِمْ عِنْدَمَا يُؤَرِّخُونَ حَيَاةَ الرَّسُولِ أَوْ يَدْرُسُونَ سُنَّتَهُ»[1].

وە لە پێشەکی کتێبی "تاريخ حياة سيدنا محمد" دەڵێت: «إِنَّهُ مِنَ الْمُتَعَذَّرِ بَلْ مَنْ الْمُسْتَحِيلِ أَنْ يَتَحَرَّرَ الْمُسْتَشْرِقُونَ مِنْ عَوَاطِفِهِمْ وَنَزَعَاتِهِمْ الْمُخْتَلِفَةِ، وَإِنَّهُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَدْ بَلَغَ تَحْرِيفُ بَعْضِهِمْ لِسِيرَةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَبْلَغًا غَطَّى عَلَى الوَاقِعِ وَأَخْفَى الصُّورَةَ الحَقِيقِيَّةَ، وَذَلِكَ بِالرَّغْمِ مِمَّا يَزْعُمُهُ الْمُسْتَشْرِقُونَ مِنْ اتِّبَاعِهِمْ لأَسَالِيبِ النَّقْدِ البَرِيئَةِ وَلِقَوَانِينَ البَحْثِ العِلْمِيِّ الْمُحَايِدِ»[2].

واتە: زۆر ئەستەمە ڕۆژهەڵاتناسێك بتوانێت لە بەرگی سۆزی دینی خۆی و ڕەگەزی دەرچێت، کاتێك ژیانی پێغەمبەر ﷺ و سوننەتەکەی دەنووسێت، بۆیە کار گەیشتە ئەوەی کە گۆڕانکاری لە ژیانی پێغەمبەردا دروست بکات و ڕاستییەکان بشارێتەوە، گەرچی واش دەری ببڕێت کە توێژینەوەیەکی زانستی بێلایەنەیە.

وە لە کۆتایی ئەم سەدەیەشدا ئەم بابەتانە بەو شێوازە ورووژێنرانەوە لەسەر دەستی عەلمانییەکانی میسر، هەر لە سەردەمی (محمد عبده) کە بەرهەڵستییانی کرد تاوەکوو ئەم کۆتاییە، وە لە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیش گرووپی قورئانییەکان دروست بوون لە هیندستان لەسەر دەستی (أحمد خان)، وە زانکۆی (عليكرة)ی بۆ دروستکرد، هەردوو لایان زیندووکردنەوەی هەموو بیروڕای فیرقە کۆنەکانی ئیسلام بوو، بە شێوەیەکی تێکەڵ لە (موعتەزیلە و خەوارج و ڕافیزە و قەدەرییە)کان و قسەوباسی (مستشرق)ەکان، کە ئەمە بە ئاشکرا پاشکۆ و کاریگەری دوای داگیرکەرانی ئیستیعماری ئەورووپی بوون بەسەر جیهانی ئیسلامییەوە، وە ئەمڕۆش

(١) (٢) "السُّنَّة في مواجهة شُبُهات الاستشراق" لأنور الجندي ص١٢.

موسوڵمانان لەژێر گوشاری عەلمانییەت و بەجیهانگیری و تێکەڵی دەسەڵاتەکانی ئەم سەردەمە و بیروڕای ئازاد؛ هەمان جۆر و هەرجارەی لە بەرگێکدا قسە لەسەر فەرموودە دەکرێت و ڕەخنە لە هاوەڵان دەگیرێت و گومان لە کۆمەڵێك یاسای ئیسلام دەکرێت لە (حكم المرتد والرجم الزاني والسحر ...)، بەڵام ئەمە نامۆ نییە، لەبەرئەوەی درێژەپێدەری فیرەقە کەلامییەکانە.

قَالَ بَعْضُ الْسَّلَف: «إِنَّ أَهْلُ الْكَلَامِ أَعْدَاءُ الْدِّيْن»[(١)].

واتە: خاوەن بیروڕاکان دوژمنی دینن.

لەبەرئەوەی وەك ئیمام (أحمد) ﵀ دەڵێت: «فَهُمْ مُخْتَلِفُونَ فِي الْكِتَابِ؛ مُخَالِفُونَ لِلْكِتَابِ؛ مُتَّفِقُونَ عَلَى مُخَالَفَةِ الْكِتَابِ»[(٢)].

واتە: خاوەنی خوێندنەوەی جیاوازن بۆ قورئان، وە هەمووشیان پێچەوانەی قورئانن، وە لە کۆتادا هەموویان کۆدەنگن لە جیابوونەوەی قورئان.

**بەڵام لە هەمووی سەیر و سەمەرەتر ئەوەیە ئەوەی کە بڕیاری کارنەکردن بە فەرموودە و ڕەخنە لە نووسینەوەی دەگرێت:**

یەکەم: هیچ زانایەکی فەرموودەناس خاوەنی ئەم قسانە نییە، بەڵکوو عەقلانییەکان و کەسانی بێئاگا لە بواری فەرموودەناسیدا (علوم الحديث) ئەو جۆرە بڕیارانەیان هەیە، تەنانەت کەسێکیان تێدا هەڵنەکەوتووە لەم زانستەدا، وە گەر هەڵیشکەوتایە لەوان نەدەبوو.

دووەم: ئەم قسانە قسەکردنێکە لە (مستحيلات)، کە مەبەست پێی جیاکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ لە قورئان و نەمانی شیکاری و شەرحی پێغەمبەر ﷺ لە موعجیزەکەی و لێسەندنەوەی (رسالة) و پەیامەکەیەتی و دانە دەستی هەموو عەقڵەکانە تا ڕۆژی دوایی و هەر سەردەمەو کەسێك بە شێوەیەك پێغەمبەرایەتی بەسەرەوە بکات.

(١) "بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية" لابن تيمية (١/ ٤٢٦).

(٢) "الرد على الجهمية والزنادقة" لأحمد بن حنبل ص٥٦، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٤٤)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ١٤٢).

سێیەم: شکاندنی خودی فەرمان و داواکارییەکانی قورئانە لە جیبەجێکردن و گوێڕایەڵی سوننەتدا.

چوارەم: لە واقعیشدا؛ نەبوونی هیچ جێگرەوەیك (بدیل) بۆ قورئان وەکوو سوننەت.

پێنجەم: کەسانی خاوەنی ئەم قسانە خۆیان دەبیننەوە لە بازنەی فیرەقە گومڕاکان و پێوەدیاربوونی لاوازی ئیمان و پەیوەستە دینییەکان، وە لە پاشماوەی دوژمنان هەژمار دەکرێن، وە لە بەرامبەر هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و هەرچی زانایانی فەرموودەناس (جمهور المحدثین) و گشت خواناسان و ساڵحان و دیندارانی پاکدا ڕاوەستاون.

شەشەم: جیبەجێکاری هەموو دین و کۆکەرەوەی هەموو بەڵگەکان لەکوێ و خۆدزینەوە و دەرچوون و فێڵ لە بەڵگە و پێشخەری ڕا و هەواوئارەزووەکان لەکوێ!

حەوتەم: جیاکردنەوەی (المتابعة) لە (الإخلاص) و نەچوونە ژێر باری (توحید الألوهیة) ... .

ئەم هەڵوێستانە هەمووی لەکارخستنە (التعطیل) و باوەڕپێنەبوونە، چۆن لە (تەوحید)دا (تعطیل الکلي والجزئي) هەیە، بەو شێوەیەش لە (سوننەت)دا هەیە، واتە کارنەکردن بە تەواوی سوننەت و دژایەتی خاوەنەکەی، یاخود لەکارخستنیەتی بە ڕێژەیی، جارێك بەناوی (خبر الآحاد)، وە جارێك بەناوی (ظني الدلالة)، وە جارێك بەناوی گومان لە بووندا (ظني الثبوت) ... .

بەڵام ئەم بڕیار و قسانە نامۆ نین، بەڵکوو هەمووی هەواوئارەزووەکانی ئادەمیزاردە و پێغەمبەریش ﷺ دەربارەیان دەفەرمویت:

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّهُ سَيَخْرُجُ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ تَجَارَى بِهِمْ تِلْكَ الْأَهْوَاءُ، كَمَا يَتَجَارَى الْكَلْبُ لِصَاحِبِهِ»، وَقَالَ عَمْرٌو: «الْكَلْبُ بِصَاحِبِهِ لَا يَبْقَى مِنْهُ عِرْقٌ وَلَا مَفْصِلٌ إِلَّا دَخَلَهُ»[1].

---

(١) رواه أبو داود (٤٥٩٧)، وأحمد في "المسند" (١٦٩٣٧)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٣)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٤)، وفي "الشاميين" (١٠٠٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٥٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٧/ ٤٧٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٦٤١)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥١)، و "المشكاة" (١٧٢).

واتە: کۆمەڵانێك دێن لە گەلەکەم، هەوا و ئارەزووەکانیان بڵاو بووەتەوە تیایاندا، وەکوو سەگ گەستە[١] بە خاوەنەکەیدا، هەموو دەمار و جومگەیەکی دەگرێتەوە.

اللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ



أحمد ملا فائق سعيد

١٥ / جمادى الآخرة / ١٤٣٨ هـ

١٦ / ٣ / ٢٠١٧ م - الخميس

سلێمانی

---

(١) سەگ گەستە بریتییە لە نەخۆشی هاری سەگ (Rabies)، کە مرۆڤ لە ڕێگەی گەستنی سەگی تووشبوو بە ڤایرۆسەکە تووش دەبێت و بە خێرایی بە هەموو لەشیدا بڵاو دەبێتەوە و لە ماوەی دوو تا دە ڕۆژدا مرۆڤ دەکوژێت گەر چارەسەر نەکرێت، پێغەمبەریش ﷺ نموونەی کەسانی شوێنکەوتەی هەواوئارەزووەکانی بەم نەخۆشییە هێناوەتەوە و شوبهاندوویەتی، کە مەبەست پێی: هەواوئارەزوو بە خێرایی بە هەموو لەشی مرۆڤدا بڵاو دەبێتەوە، هەروەکوو چۆن سەگ گەستە بە خێرایی بە هەموو لەشدا بڵاودەبێتەوە، گەر لێی دوور نەکەوێتەوە و خۆی چارەسەر نەکات ئەوا لە لێواری تیاچوونە.

# بەشی یەکەم

## فەرمووده و نووسینەوەی

## ( كتابة الحديث )

لەدوای لێدانی کەسایەتی ناودارانی هاوەڵان لە فەرموودەدا، باس و گومان دروستکردن دێتە کایەوە لەسەر نووسینەوەی فەرمووده لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیدا، بۆ زیاتر گومان دروستکردن لەسەر کارنەکردن بە فەرمووده، بە هەر ڕێگەیەك بێت لە ڕێگەکانی وەك:

١. ڕەتکردنەوەی فەرمووده بەناوی نەگونجاوی لەگەڵ عەقڵدا.

٢. بەبەڵگەنەکردنی فەرمووده و پێویستنەبوونی لەپاش قورئان.

٣. کارنەکردن بە فەرموودەکانی (آحاد) بە گشتی، یاخود لە بواری (عقیدة) و حەڵاڵ و حەرامدا.

٤. زاڵکردنی گومان بەسەر ڕاوییەکاندا، یاخود دەقەکانی فەرموودەدا، لەبەر جیاوازی کەسەکان و درووستبوونی گومان لەسەریان، یاخود جیاوازی دارشتن و وشەی دەقەکان، وەکوو: (زيادة على النص، زيادة الراوي، الشاذ، الغريب)، بەگشتی فەرمووده خراوەتە ژێر باری ناونیشانی (ظني الدلالة)ەوە، واتە بەڵگەی گوماناوی، کە یەکێك لە هەرە گومانەکان نەنووسینەوەی فەرموودەیە وەکوو قورئان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵاندا.

ئەم بابەتە زۆر لەمێژەوە لەلایەن فیرەقە گومڕاکانی ناو ئیسلام وروووژێنراوە، هیچ مەبەستێکیش لە پشتییەوە نییە بێجگە لە لێدان و لەکارخستنی فەرمووده نەبێت.

بۆ ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم بۆچوون و گومانانە کە بۆچی فەرمووده وەکوو قورئان نەنووسراوەتەوە و نەپارێزراوە، وە بگرە بە نزیکەی سەدەیەك دوای پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتە کار بۆ کۆکردنەوەی کراوە، لە سەردەمی خەلیفە (عمر بن عبد العزيز) رحمه الله لەسەر دەستی ئیمام (أبو شهاب الزهري) رحمه الله؛ زانایان دەڵێن:

**یەکەم:** ئایا نووسینەوە مەرجێکە لە بوون بە بەڵگە ؟ (هل الكتابة شرط في الحجية؟) .

**لە وەڵامدا:** نووسین هۆکار و ڕێگەیەکە لە بەڵگەکاری، بەڵام مەرج نییە بە بوونی بوون بێت و بە نەبوونی نەبوون بێت، بەڵکوو متمانە و دادوەری کەسەکە مەرجی بنەڕەتییە بۆ پاراستنی بەڵگە لە هەڵە و گۆڕانکاری، کە پێی دەوترێت (العدالة).

**تێبینی:** هۆکار و ڕێگەی گەیاندنی بەڵگە سێ جۆرە: نووسین، لەبەرکردن، گەیاندن بە تێگەیشتن (المفهوم).

هەریەك لەم سیانە گەر خاوەنەکەی و کەسەکە شوێنی متمانە و دادوەری (الثقة والعدالة) نەبێت؛ ئەوا بە هیچ شێوەیەك بەڵگە نییە، لەبەر دڵنیا نەبوون لە هەڵە و گۆڕانکاری تیایدا، وە گەر بە هەریەکێك لەو ڕێگایانە بگەیەنرێت بە مەرجی بوونی دڵنیایی و متمانەی خاوەنەکەی (عدالة الراوي)، ئەوا دەبێتە بەڵگە، ئەگەرچی بە بوونی هەرسێ ڕێگاکە یاخود (نووسین و لەبەرکردن) لەگەڵ بوونی (عدالة) دادوەری ڕاوییەکە دڵنیایی زیاتر دەبەخشێت، خۆ ئەگەر لەبەرکردن هەبێت بەبێ نووسین، لەگەڵ بوونی متمانە و دڵنیایی تەواوی ڕاوییەکە لەسەر گەیاندنی؛ ئەوا ناتوانرێت لە بەڵگە دەربکرێت، بەتایبەت ئەگەر بێت و بەڵگەکە هیچ دژایەتی و پێچەوانەییەتییەکی گشتی قورئان و فەرمووده و ئاشناییەکانی ئیسلام نەکات، ئەوا متمانە و دڵنیایی زیاتر دەبەخشێت، کەواتە کەسانی ناودار و تەزکییەکراوی قورئان و فەرمووده لە هاوەڵان؛ ئەمە متمانەی تەواوە، وە ڕیوایەتەکانیشیان هەمووی مایەی کامڵی و تەواوی و ڕوونکردنەوەی دینییە، بەبێ بوونی هیچ جۆرە دژایەتییەك و پێچەوانەییەتییەك، ئەوا تەواوی دڵنیایی بەڵگە دەدات بەدەستەوە، لەم حاڵەتەدا نەبوونی نووسین نابێتە هۆکاری دەرکردنی لە بەڵگە.

ئەی نابینیت تەورات و ئینجیل نووسراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانکارییان بەسەردا هات، بە هۆکاری نەبوونی متمانە لەسەر دەستی هەڵگرانی، تا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی متمانەی هیچی لێ ناکرێت، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ٧٩﴾ [البَقَرَة : ٧٩].

واتە: هەڕەشە بە سزا و تۆڵە بۆ ئەوانەی بەدەستی خۆیان تەورات و ئینجیل دەنووسنەوە، بە ئارەزوو و ویستی خۆیان و دەیانوت ئەمە لەلایەن خواوەیە، بۆ بەدەستهێنانی پول و پارەیەکی کەم، سزا و هاوار بۆ خۆیان و دەستکەوتەکانیان.

خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئاماژە دەکات بۆ گۆڕانکاری تەواو لە تەورات و ئینجیلدا.

کەواتە نووسینەوە هیچ سوودێکی نەما، وە نووسینەوە نەبووە مەرجی بەڵگەداری، ئەگەرچی هۆکارێکی گەیاندنە و متمانەی زیاتر بەدەست دەهێنێت، خۆ ئەگەر هەندێك زانست پەرتووکیان نەمێنێت وەکوو (نحو، صرف، ...)، ئەوا خاوەن کەسانی تایبەتییان کە هەموویان لەبەرە؛ دەتوانن بینووسنەوە سەرلەنوێ، گەر بەو پێوەرە بێت کەوا بەبێ نووسین لێی وەرنەگیرێت و نەبێتە بەڵگە لەسەر ئەو بابەتە؛ ئەوا هەرچی نابینایە و لەبەرکاری هەموو قورئانە، بگرە بە جۆری خوێندنەوەکانەوە؛ نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دەیخوێنین قورئان بێت و درووستی جۆری خوێندنەوەکان بێت.

## بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە لەسەر بەمەرجنەگرتنی نووسین لە بەڵگەدا، دەڵێین:

١. پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەر و بانگخوازەکانی دەنارد بۆ هۆز و تیرە جیاوازەکانی عەرەب بۆ بانگەوازیکردنیان بۆ ئیسلام و فێرکردنی یاساکان و ئەنجامدانی دروشم و عیبادەتەکان پێیان و ئاشناکردنیان بە شێوەیەکی پێویست و گشتی لە دین، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ هەموو ئەو کارانە و وردەکارییەکانی نووسراو و بەڵگەیان پێنەبوو بیخەنە ڕوو بۆ کار بە کار و وتە بە وتەی کارەکانی کە پێیان دەگەیەنێت لە قورئان و فەرمووده، بێجگە لە نامەیەکی تایبەتی خۆی نەبێت بۆ سەلماندنی نوێنەرایەتی ئەم کەسە و ڕاست و درووستی کاربەڕێکارییەتییەکەی (ئەمیرایەتییەکەی).

ئەمە ڕوونکەرەوەیەکی تەواوە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دادوەری و متمانەی ئەم نوێنەرە و شارەزایەتی دینی تەواو زانیوە بۆ بەڵگەکاری (إقامة الحجة)ی سەر ئەو خەڵکە و پەیوەستکردنیان پێوەی بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی.

٢. نوێژ یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام، هیچ کەسێك ناتوانێت شارەزا بێت بەسەر چۆنییەتی و وردەکارییەکانی لە قورئاندا، بەڵکوو دەبێت هەموو ئەمانە ڕوونکردنەوەیان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بێت، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی نەداوە بە نووسینەوەی چۆنێتی و شیکردنەوەی بە وتە و

کردار، بەڵکوو هەر بە شێوەی زارەکی و لەبەرکردن فێری هاوەڵانی کردووە.

وە گەر نووسینەوە تەواوکاری بەڵگە بوایە؛ ئەوا پێغەمبەر ﷺ ئەم کارە پڕ گرنگییەی واز لێ نەدەهێنا بۆ هاوەڵان و تابعین و چینی دوای ئەوان، کە نە توانرێت بە عەقڵ و خوێندنەوەی قورئان چۆنێتییەکەی شارەزا بن، بەڵکوو بۆی دەنووسینەوە تاوەکوو بەڵگەکاری بێت لەسەریان، لەگەڵ ئەمەشدا هاوەڵان بە ڕێگەی لەبەرکردن و تێگەیشتن پێیان گەیاندوون، ئەوانیش لەسەر متمانەی هاوەڵان وەریان گرتووە و گەیاندوویانە بە دوای خۆیان.

**٣.** بێگومانین لەوەی کردەوە و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیەکی پێویستی دینییە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەداوە بە نووسینەوەی گشت ئەو کار و فەرموودانەی کە لەوەوە دەردەچێت، کە ئەمە بۆ خۆی پێویستییەکی دینی زۆر گرنگە، شایەنی پشتگوێخستن نییە.

گەر بەڵگەکاری وەستابێت لەسەر نووسینەوە؛ نەدەبوایە پێغەمبەر ﷺ ئەم کارەی ئەنجام نەدایە و هاوەڵانی بەبێ بەڵگەی نووسینەوەی فەرموودە بهێڵێتەوە و لەلایەکی ترەوە ئەم کارە بخاتە ئەستۆی هاوەڵان.

**٤.** وەرگرتنی قورئان لە (جبريل)ەوە عليه السلام بۆ پێغەمبەر ﷺ بە لەبەرکردن بووە نەك نووسینەوە، لەبەر متمانەی تەواوی (جبريل) عليه السلام، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣﴾ [الشعراء: ١٩٣]، بەهێز و ئەمانەتپارێزە، فریشتەی تایبەتی وەحییە لەلایەن خواوە جل جلاله، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی دڵنیابوونی تەواوەوە وەری گرتووە، بۆیە خوای گەورە جل جلاله دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ٢٠ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ٢١﴾ [التكوير: ١٩ - ٢١].

وەسفی (جبريل) عليه السلام دەکات بە بەخشندەیی و خاوەن هێز و باڵادەست لەلای خوا، وە خاوەن فرمان و جێی متمانە و ئەمانەتپارێزە.

وە هاوەڵانیش بە هۆکاری پارێزراوێتی (معصومية)ی پێغەمبەر ﷺ لێیان وەرگرتووە بە لەبەرکردن بەبێ نووسینەوە، لەبەر پلەوپایەی (جبريل ومحمد) عليهما السلام کە (معصوم) و پارێزراوی خوایی بوون؛ گەیەنراوە و وەرگیراوە بە هۆکاری دەستی ئەمینەوە و پاشان نووسراوەتەوە و لەبەر کراوە و لە دەستی ئەمینەکاندا گەیەنراوە، ئەوانەیش کە هەڵگری ئەم کارە بوون خاوەن دادوەری

و متمانەی دینی (عدالة) بوون، هەر لە هاوەڵان و تابعینەکان، وە چیناوچین گەیشتووە و وەکوو خۆی پارێزراوە.

کەواتە لێرەدا نووسینەوە هیچ بوارێکی سەرەتایی نەبووە و تا ئێستاش پارێزراوە بە هۆکاری (معصومیة وعدالة)ی خاوەنەکانیان و هەڵگرانییەوە.

بەڵام (تەورات و ئینجیل) خۆ بە نووسراوی گەیشتووەتە دەستی (موسی وعیسی) ﻹ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر کە لە سەردەمی پێغەمبەرەکانیان دەرچووە گۆڕانکاری و دەستیێوەردانی تێدا درووست بووە، بە ڕێژەیەك جیاناکرێتەوە لە ئەسڵییەکە، بە هۆکاری نەبوونی دادوەری و متمانە (عدالة)ی هەڵگرانی، هەر لە حەوارییەکانەوە تا کۆتاییان.

خۆ ئەوەش نووسینەوە هەبوو، بەو پێوەرە دەبوایە پارێزراوی بە ڕێژەیەکی زۆر تیایدا بوایە، کەواتە نووسینەوە و لەبەرکردن و (مفهوم)یش گەر متمانە و دادوەری تەواوی لەگەڵدا نەبێت بۆ هەڵگرانی و خاوەنەکانیان؛ ئەوا پاراستن دروست نابێت.

کەواتە گەیشتینە ئەو دەرەنجامەی کە دادوەری ڕاوی و کەسەکان (عدالة الراوي) بنەمایە بۆ وەرگرتن، وە نووسینەوە مەرجێك نییە لە بەڵگەکاریدا.

بۆ زیاتر نموونە، ئەوەتا خوای پەروەردگار بۆ قەرزدان فەرمان دەکات کە بینووسنەوە لە نێوانیاندا، وەکوو دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ۚ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌۢ بِٱلْعَدْلِ﴾ [البقرة : ٢٨٢].

واتە: ئەی ئیمانداران، گەر قەرزێکتان دا بۆ کاتێکی دیاریکراو، با کەسێکی دادوەر لەنێوانتاندا بینووسێت.

لێرەشدا هەر داوا دەکات نووسەری قەرزەکە دەبێت کەسێك بێت مەرجی (عدالة)ی تێدا بێت، تاوەکوو گۆڕانکاری و هەڵە لە نووسینەکەدا نەبێت، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَـٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَـٰنَتَهُۥ﴾ [البقرة : ٢٨٣].

واتە: ... ئەگەر متمانەتان لەسەر یەکتری هەبوو، ئەوا ئەمانەتەکان بۆ یەکتری بگێڕنەوە.

قَالَ (الشَّعْبِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «إِذَا ائْتَمَنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلَا بَأْسَ أَلَّا تَكْتُبُوا أَوْ لَا تُشهدوا»[1].

ئیمامی (الشعبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ئەگەر هەندێکتان متمانەتان هەبوو لەسەر یەکتری؛ ئەوا پێویست بە نووسین و شایەتیش ناکات.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر لە نووسینی قەرزەکە و لە نەنووسینیشی دادوەری و متمانەی بە مەرج گرتووە، بەو مانایەی نووسین و لەبەرکردن پێش دادوەری و متمانەی ڕاوییەکە (عدالة الراوي) ناکەوێت.

کەواتە هەڵەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە نووسینەوە بکرێتە مەرج بۆ وەرگرتنی بەڵگە لە ڕیوایەتدا و بە بەڵگەکردن لەسەری بنیاد بنرێت و متمانەی ڕاوییەکە دوابخرێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەنگی مەحەکی هەرسێ جۆری گواستنەوەکەیە، بە بوونی لە هەریەکێك لەو سێ بەشەدا مەرجی بوونە بەڵگەیە و بە نەبوونی نەبوونە، بەبێ پێچەوانەکەی.

نووسراوی کەسێکی بێ متمانە و دادوەر هیچ نادات بەدەستەوە لە دڵنیایی و گومان، لەبەرئەوەی ڕەنگە بە گومان دابنرێت، بەڵام ئەمجارە گومانی تیادا نەبێت، وە هەروەها بۆ نووسراوێکی خاوەن متمانە و دادوەریش کە بگاتە دەستمان بە ڕێگەی کەسێکی خاوەن نەبووی (عدالة).

بەڵام ئەگەر خاوەن نووسراوێك (عدالة) بێت، وە بەهەمان شێوە کەسی گوێزەرەوەکەی خاوەن متمانە و (عدالة) بێت؛ ئەوا شوێنی دڵنیاییە و ئەگەری هەرشتێك تیایدا زۆر لاوازە، ئەم لاوازییەش دەڕەوێتەوە بە بوونی ژمارەی زۆری ڕاوییەکان و ڕێگەی ڕیوایەتەکان (تواتر)، یان کەسایەتی تایبەتی ڕاوییەکان.

٥. لەبەرکردن بەهێزترە تا نووسینەوە و مایەی سوودمەندیترە.

لەبەرکردنەکان زۆرینەیان بە تێگەیشتن و دەرککردن بە ماناکانیانەوە لەبەر کراون، تاوەکوو هۆکارێك بێت بۆ لەبیرنەچوونەوە، وە زۆر ئاسانکارییە بۆ پیاچوونەوەی بەردەوام؛ هەرکاتێك خاوەنەکەی بیەوێت لە هەر کات و ساتێکدا بێت، بۆ زیاتر مسۆگەری و دڵنیابوون و مانەوەی.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (١/٧٢٨) في تفسير سورة [ٱلْبَقَرَةِ : آيَةٌ : ٢٨٣].

بە پێچەوانەی نووسینەوە، کە زۆرتر خاوەنەکەی پشت بە نووسینەکەی دەبەستێت بۆ تێگەیشتن و مانەوەی، وە پێداچوونەوەیشی پێویست بە هەڵگرتن و گواستنەوە و پاراستن دەکات، بگرە هەندێك جار پێویست بە شارەزاییەك دەکات بۆ شیکردنەوەی، لەبەرئەوەی کاتی خۆی لێی تێنەگەیشتووە و دایناوە دوایی لێی تێبگات.

بۆیە تەنانەت زانایان نووسینەوەیان بە گومان داناوە تاوەکوو لەبەرکردن، وە گەر فەرموودەیەکی بیستراو و نووسراو دژایەتی و پێچەوانەی یەك بوون؛ ئەوا بۆ بەهێزکردنی لایەك بەسەر لاکەی تردا (الترجیح)، پەنا دەبەنە بەر بیستراو کە بەهێزتر و لەپێشترە تاوەکوو نووسراو.

وەك ئیمامی (الآمدي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «أَمَّا مَا يَعُودُ إِلَى الْمَرْوِيِّ فَتَرْجِيحَاتٌ: الْأَوَّلُ: أَنْ تَكُونَ رِوَايَةُ أَحَدِ الْخَبَرَيْنِ عَنْ سَمَاعٍ مِنَ النَّبِيِّ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَالرِّوَايَةُ الْأُخْرَى عَنْ كِتَابٍ، فَرِوَايَةُ السَّمَاعِ أَوْلَى لِبُعْدِهَا عَنْ تَطَرُّقِ التَّصْحِيفِ وَالْغَلَطِ»(١).

لەبەرئەوەی بیستراو دوورتر گومانی هەڵە و دەستکاریکردن و ڕاستکردنەوەی تیادا بەدی دەکرێت، وە گێڕانەوەی فەرموودە بە ڕێپێدانی نووسراوەی فەرموودەکان دەبێت، کە پێی دەوترێت (المناولة أو المكاتبة)، واتە پێدان و بۆنووسین لە مامۆستاوە بۆ قوتابییەکەی کە لەرێی ئەوەوە بیگەیەنێت، وەکوو (ابن حجر) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَأَقُولُ شَرْطُ قِيَامِ الْحُجَّةِ بِالْمُكَاتَبَةِ أَنْ يَكُونَ الْكِتَابُ مَخْتُومًا وَحَامِلُهُ مُؤْتَمَنًا وَالْمَكْتُوبُ إِلَيْهِ يَعْرِفُ خَطَّ الشَّيْخِ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ مِنَ الشُّرُوطِ الدَّافِعَةِ لِتَوَهُّمِ التَّغْيِيرِ وَاللهُ أَعْلَمُ»(٢).

واتە: مەرجەکانی دڵنیابوونی ڕاست و درووستی نووسراوە وەرگیراوەکە دەبێت مۆری خاوەنەکەی پێوە بێت، وە هەڵگرەکەشی ئەمین بێت، وە شێوازی نووسینی مامۆستاکەی ناسراو بێت لای، ... چەندەها مەرجی تر بۆ ڕەواندنەوەی گومان لەسەری.

بە کورتی و کۆکراوەیی: نووسین ئەگەری زۆرتر گۆڕانکاری لەخۆ دەگرێت تا لەبەرکردن، مەگەر لەبەردەم شێخەکەی و مامۆستاکەیدا، ئەوکات هۆکاری تەواوی متمانە و دڵنیایی بەدەست دێت تیایدا.

---

(١) "الإحكام في أصول الأحكام" للآمدي (٤/ ٢٤٨).

(٢) "فتح الباري شرح صحيح البخاري" لابن حجر (١/ ١٥٥).

**٦.** نووسینەوه و لەبەرکردن هۆکارێکن بۆ پاراستنی شتەکان، وه گەر لایەك لاواز بوو لاکەی تری بەهێزی دەکات.

عەرەب لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و پێش ئەویشدا گەلێکی نەخوێندەوار بوون، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا﴾ [الجمعة : ٢]، ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ﴾ [آل عمران : ٢٠]، ﴿لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ﴾ [آل عمران : ٧٥]، زۆر دەگمەن بوو خوێندەوار تیایاندا، وه گەر بشبوایە بەشێوەیەکی سەرەتایی بوو، قابیل بە بوونی هەموو جۆره هەڵە و ناتەواوییەك بووه، کە ئەمانە دەبووه هۆکاری هەموو هەڵە و لێتێکچوونێك، بەتایبەت لە کاتێکدا کە هێشتا هۆکارەکانی جیاکردنەوەی بەخۆیەوه نەبینیبوو لە خاڵ و شکڵ و سەروبۆردا، کە بۆخۆی سەرەتای ئەمانەش لە سەردەمی (عبد الملك بن مروان)دا دەستکرا بە پەرەپێدانی[1]، بەتایبەت لە سەردەمی هاوەڵان کە بەو شێوەیە بووه، بۆیە بە ناچاری پەنایان بردووەتە بەر لەبەرکردن بۆ مێژوو و چیرۆك و بەسەرهاتەکان و پەیماننامەکانیان و پێویستییەکانی ژیانیان، تاوەکوو بووه بە توانایەکی تایبەتی سەرکەوتوو تیایاندا (ملکه)، بە شێوەیەك هەڵەیان کەم دەکرد تیایاندا، لەگەڵ ئەو ژیانە ساده و ساکارییەش کە تیایدا دەژیان، ئەمەش لەلایەکەوه هۆکاری سەرکەوتوییان بوو، بەپێچەوانەی گەلانی ڕاهاتوو لەسەر نووسین و خوێندەواری و بوونی ژیانێکی زۆر ئاڵۆز و جەنجاڵ، وەکوو فارس و ڕۆمەکانی ئەو سەردەمە کە بە ناچاری پەنایان بردووەتە بەر نووسینەوه بۆ لەبیرنەچوونەوه و هەڵە نەبوون، بۆیە لەبەرکردنەکانیان پڕ لە هەڵە و لێتێکچوون بوو ... .

نموونەی ئەمە دەبینین لە کەسێکی نابینادا کاتێك چاوی لێ دەسەندرێتەوه، هەموو گرنگییەکی دەدات بە بیستن و لەبەرکردن و دەتوانێت لە بریتی نووسینەوه هەموو شتەکانی لەبەر بێت، بەڵام چاوساغ و بینەر گرنگی دەدات بە نووسینەوه و کتێب و پشت و پەنای نووسراوەکان بۆ گەڕانەوه سەریان و پیاچوونەوەیان.

بۆیە لە گیانلەبەریشدا هەریەکەیان گرنگی دەداتە هەستێکی، لە بۆنکردن و بیستن و بینین، بەو هۆکارەوه هەموو کارەکانی بەڕێ دەکات.

---

(١) "تأريخ القرآن الكريم" لمحمد طاهر الكردي ص٦٧، و "الوسيط في علوم ومصطلح الحديث" لأبو شُهبة ص١٣٣.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هۆکاری هاندانی لەبەرکردن و ڕێگری لە نووسینەوە لەناو هاوەڵان و تابعیندا بۆ قوتابییەکانیان، ڕاهاتوویی سەردەمی خۆیانە بۆ بەهێزکردن و ڕاگرتنی توانای لەبەرکردن، کە باو و بڵاو و ڕاهاتوویەکی گشتی ناو کۆمەڵگایان بووە و مایەی پێشبڕکێ و ناوداری ناویان بووە، وە ئادەمیزادیش حەز و پێخۆشبووەکانی لەسەر ڕاهاتوویەکانییەتی، وە دژی پێچەوانەیی و کارە لاوازەکانییەتی.

قَالَ (إِبْرَاهِيم النَّخَعِي) رَحِمَهُ اللهُ: «لَا تَكْتُبُوا فَتَتَّكِلُوا»[١].

واتە: (ئیبراهیمی نەخەعی) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: مەنووسنەوە تا پاڵ نەدەنەوە.

وە دەیوت: «قَلَّمَا كَتَبَ رَجُلٌ كِتَابًا إِلَّا اتَّكَلَ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: زۆر کەم هەن پیاوانێك کتێبێك نەنووسنەوە و پشتی پێ نەبەستن.

وَقَالَ (الشَّعْبِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «مَا كَتَبْتُ سَوْدَاءَ فِي بَيْضَاءَ قَطُّ، وَمَا سَمِعْتُ مِنْ رَجُلٍ حَدِيثًا قَطُّ فَأَرَدْتُ أَنْ يُعِيدَهُ عَلَيَّ»[٣].

واتە: ئیمامی (شەعبی) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ڕەشاییم لە سپێتیدا نەنووسیوە (بەو مانایەی کە لەسەر کاغەز هیچ شتێکم نەنووسیوەتەوە، بەڵکوو هەموویم لەبەر کردووە)، وە هەر فەرموودەیەکم لە یەکێکەوە بیستبێت؛ نەمویستووە دووبارەی بکاتەوە بۆم (واتە دەستبەجێ لەبەرم کردووە و پێویستی نەکردووە دووبارە بکرێتەوە تا بۆم لەبەر بکرێت).

---

(١) رواه ابن عبد البر في "الجامع" (٣٧٣)، وفي "المطالب العالية" لابن حجر (٣٠٣٢).

(٢) رواه ابن عبد البر في "الجامع" (٣٧٤)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٦/ ٢٨٠)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٤/ ٥٢٢).

(٣) رواه الدارمي في "السنن" (٤٩٩)، وقال محققه (الداراني): إسناده صحيح، وابن حبان في "أخبار القضاة" (٢/ ٤٢٠)، وابن أبي حاتم في "الجرح والتعديل" (٦/ ٣٢٣)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٦/ ٢٦٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/ ٣٢١)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٦٨)، وابن الملقن في "البدر المنير" (١/ ٢٦٤)، وفي "العلم" لزهير بن حرب (٢٨)، و "إتحاف الخيرة المهرة" للبوصيري (٣٦٢)، و "المنتظم" لابن الجوزي (٧/ ٩٣)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٧/ ١٢٥)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٢٢٢)، و "تأريخ بغداد" للبغدادي (٧/ ٣٦٢)، و "تذكرة الحفاظ" للذهبي (١/ ٦٦)، و "سير السلف الصالحين" للأصبهاني ص٨٨٧، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٨/ ١٣٦)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٢/ ٣٨٤)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٥/ ٦٧)، و "طبقات الحفاظ" للسيوطي (٧٤).

وە (سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيز) رَحِمَهُ اللَّهُ وەسفی خۆی دەكات بەوەی كە دەڵێت: «مَا كَتَبْتُ حَدِيثًا قَطُّ»[(١)].

واتە: بە هیچ شێوەیەك فەرموودەیەكم نەنووسیوەتەوە.

ئیمامی (الأَوْزَاعِي) رَحِمَهُ اللَّهُ كاتێك فەرمووده بەسەر قوتابییەكانیدا دەخوێنێتەوە و پاشان هەڵەكانیان لە نووسینەكاندا بۆ ڕاست دەكاتەوە دەڵێت: «كَانَ هَذَا الْعِلْمُ شَيْئًا شَرِيفًا، إِذْ كَانَ مِنْ أَفْوَاهِ الرِّجَالِ يَتَلَاقَوْنَهُ وَيَتَذَاكَرُونَهُ، فَلَمَّا صَارَ فِي الْكُتُبِ ذَهَبَ نُورُهُ وَصَارَ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ»[(٢)].

واتە: ئەم زانستە شەرعییە شتێكی زۆر بەڕێز بوو، كاتێك كە لە دەمی زانایانەوە وەردەگیرا و پیاچوونەوە و بیرخستنەوەی لەسەر دەكرا، بەڵام كاتێك خرایە ناو كتێب، نوور و ڕووناكییەكەی نەما و كەوتە دەستی كەسانێك كە خاوەنی نەبوون بۆی.

وَقَالَ (خَالِدٌ الْحَذَّاءُ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «مَا كَتَبْتُ حَدِيثًا قَطُّ، إِلَّا حَدِيثًا طَوِيلًا، فَإِذَا حَفِظْتُهُ مَحَوْتُهُ»[(٣)].

واتە: هیچ شتێكم نەنووسیوەتەوە بێجگە لە فەرموودەی درێژ نەبێت، بەڵام كاتێكیش كە لەبەرم كردووە سڕیومەتەوە.

قَالَ (عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «لَمْ يَكُنِ الصَّحَابَةُ وَلَا التَّابِعُونَ يَكْتُبُونَ الْأَحَادِيثَ إِنَّمَا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا لَفْظًا وَيَأْخُذُونَهَا حِفْظًا إِلَّا كِتَابَ الصَّدَقَاتِ»[(٤)].

---

(١) رواه الدارمي في "السنن" (٤٧٥)، وقال محققه (الداراني): إسناده صحيح، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٦٧)، وفي "إتحاف المهرة" لابن حجر (٢٤٢٦٦)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (١٠/ ٢١٧).

(٢) رواه الدارمي في "السنن" (٤٧٥)، وقال محققه (الداراني): إسناده صحيح، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٧١)، وفي "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٦٤.

(٣) رواه ابن الجعد في "مسنده" (١٢٦٥)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٧/ ١٩٢)، وفي "المحدث الفاصل بين الراوي والواعي" لابن خلاد ص٣٨٠، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٥٩، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٣٥، و "المعرفة والتأريخ" لأبو يوسف الفسوي (٢/ ٢٣٧)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٩/ ١٢٣)، و "تأريخ ابن معين" (٤/ ٣٤٦)، و "تأريخ أسماء الثقات" لابن شاهين ص٧٦، و "تهذيب الكمال" للمزي (٨/ ١٨١)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٦/ ٣٢٠)، و "ميزان الإعتدال" للذهبي (١/ ٦٤٣).

(٤) "ذم الكلام وأهله" للهروي (٤/ ٤٠)، و "إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري" للقسطلاني (١/ ٧)، و "شرح الزرقاني على موطأ الإمام مالك" (١/ ٦٤)، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٤٤.

واته: (عبدالله ی کوڕی دینار) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: هاوەڵان و تابعین فەرموودەیان نەدەنووسییەوە، بەڵکوو زارەکی لەبەریان دەکرد و بە خەڵکیان دەگەیاند، بێجگە لە بابەتی زەکات نەبێت، ئەویش لە بەر جۆر و ڕێژەکانی.

(عبد الله بن عباس) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قەسیدەیەك شیعری (عمر بن أبي ربيعة)ی لەبەر کردووە بە یەك جار گوێگرتن لێی، کە حەفتا و پێنج بەیتی شیعرییە، سەرەتاکەی بەم دێرە دەست پێدەکات:

أَمِنْ آلِ نُعْمٍ أَنْتَ غَادٍ فَمُبْكِرُ          غَدَاةَ غَدٍ أَمْ رَائِحٌ فَمُهْجِرٌ؟[1]

وەکوو (زيد بن ثابت) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ هەموو قورئانی لەبەر کردووە لەپێش تەمەنی پانزە ساڵی، وە زمانی (سریانی) فێر بووە لە ماوەی حەڤدە ڕۆژدا، وە (نافع مولى ابن عمر) رَحِمَهُ اللهُ هەڵەی لە لەبەرکردندا نەبووە، وە (ابن شهاب الزهري) رَحِمَهُ اللهُ لەبەرکار و (حافظ)ی سەردەمی خۆی بووە، وە (عامر الشعبي) رَحِمَهُ اللهُ دیوانی زەمانی خۆی بووە، وە (قتادة بن دعامة الدوسي) رَحِمَهُ اللهُ نموونەی پێهێنانەوەی سەردەمی خۆی بووە.

وَأَنْشَدَ الْشَّاعِرُ لِمُحَمَّدِ بْنِ بَشِيْر رَحِمَهُ اللهُ:

وَمَنْ يَكُ فِي عِلْمِهِ هَكَذَا          يَكُنْ دَهْرَهَ الْقَهْقَرِيَّ يَرْجِعُ
إِذَا لَمْ تَكُنْ حَافِظًا وَاعِيًا          فَجَمْعُكَ لِلْكُتْبِ لَا يَنْفَعُ[2]

واته: ئەگەر لەبەر کار و تێگەیشتوویی نەبێت؛ ئەوا کۆکردنەوەی کتێب هیچ سوودێکی نییە، ئایا بە نەزانین لە کۆڕەکاندا بناسرێم؛ وە زانستم لە کتێبەکانمدا بێت.

(١) "فتح المغيث بشرح ألفية الحديث" للسخاوي (٣/ ٣٨)، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (٣٨٤)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٣٠٥)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤١٨، و "الأعلام" للزركلي الدمشقي (٤/ ٩٥)، و "الجواهر والدرر" للسخاوي (١/ ٨٥).

(٢) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (١/ ٢٩٣) برقم (٣٧٦)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٢٠.

وە (منصور الفقيه) ﵀ دەڵێت:

عِلْمِي مَعِي حَيْثُ مَا يَمَّمْتُ أَحْمِلُهُ ... بَطْنِي وِعَاءٌ لَهُ لَا بَطْنَ صُنْدُوقِ

إِنْ كُنْتُ فِي الْبَيْتِ كَانَ الْعِلْمُ فِيهِ مَعِي ... أَوْ كُنْتُ فِي السُّوقِ كَانَ الْعِلْمُ فِي السُّوقِ (١)

واتە: زانستم لەگەڵمدایە لەهەر شوێنێك بم، سكم لەخۆگریەتی نەك ناوسكی سندووقێك، ئەگەر لە ماڵدا بم لەگەڵمدایە، وە گەر لە بازاڕ بم لەگەڵمدایە.

ئەگەر ئەمە كار و هێزی لەبەركردن بێت لای گشتی خەڵكی عەرەب؛ دەبێت لای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چەندە شوێنی كاملتر و بەهێزتر و گرنگیپێدانی زیاتر بووبێت؟! كە هیچ لەبەركردن و نووسینەوەیەك ناگاتە ئاستیان، لەبەر هۆكاری دڵسۆزی دینییان.

ئەو كەسانەی كە خوای پەروەردگار لێیان ڕازییە و بە گەورەترین وەسف و باس دەیانڕازێنێتەوە، وە هاوەڵێیەتی پێغەمبەرەكەیان كردووە و ئەو هەموو كۆششەیان لە بەخشینی ماڵ و جیهاد و كۆچكردن لەپێناوی ئەو دینەدا ئەنجام داوە، خاوەنی پلەوپایەیەكی گەورەن لە ئیمان و زانست و شارەزایی دینیدا، وە بەتایبەت خوای پەروەردگار هەڵیبژاردوون بۆ هەڵگرتن و گەیاندنی ئەو دینە، بەوپەڕی پڕ لە متمانەیی و ئیمانێكی تەواو و هەستكردن بە لێپرسراوێتی.

نزیك لەمانیش چینی (تابعین)ن كە پەروەردەی دەستی هاوەڵانن، شاهیدحاڵی كار و زانستی دینییانن، بە شێوەیەك كە گومان نابرێت لە هەڵگرتن و گواستنەوەی فەرموودەدا چاوپۆشییەكیان لە هەڵە و لەبیرچوون و گۆڕانكارییەك كردبێت.

٧. گەیشتنی قورئان بەڕێی لەبەركردن و زارەكی بووە، نووسینەوەكانی هۆكاری سەلماندن بووە بەوەی كە ئەوەی دەیخوێنین؛ بە دڵنیاییەوە قورئانە، خۆ ئەگەر بەس لەبەركردن بوایە بۆ گەیاندنی قورئان؛ بەس بوو بۆ سەلماندنی ڕاست و درووستی قورئان، بەڵام گەر نووسینەوە بوایە بەبێ لەبەركردن؛ ئەم دڵنیایی و یەكلاكەرەوەییە كە ئەمە بە (قطعي) قورئانە درووست نەدەبوو.

---

(١) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (١/ ٢٩٤) برقم (٣٨١)، و "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (٢/ ٢٥٠) برقم (١٧٥٩)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٢٠.

کەواتە ئەوەندەی لەبەرکردن و گەیاندنی زارەکی چین بەدوای چیندا یەکلاکەرەوە بووە و دڵنیایی داوە لەسەر دروستی قورئان؛ ئەوەندە نووسینەوە ئەو یەکلاکەرەوەییە (قطعي)ی نەدەدا بەدەستەوە، بەڵکوو دەوری هەر ئەوەندە بووە لەپاش ئەو لەبەرکردنە زارەکییە، قورئانەکە سەلمێنەری زارەکییەکە بووە بۆ ڕاستی و درووستی قورئان.

وەکوو زانایان ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن، (ابن حجر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَالْمُسْتَفَادُ مِنْ بَعْثِهِ الْمَصَاحِفَ إِنَّمَا هُوَ ثُبُوتُ إِسْنَادِ صُورَةِ الْمَكْتُوبِ فِيهَا إِلَى عُثْمَانَ لَا أَصْلَ ثُبُوتِ الْقُرْآنِ فَإِنَّهُ مُتَوَاتِرٌ عِنْدَهُمْ»(١).

واتە: سوودی ناردنی (مصاحف)ە قورئانییەکان بۆ سەلماندنی گەیاندنەوەی ئەو نووسینەوەیە بووە بۆ (عثمان بن عفان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، نەك مەبەست سەلماندنی قورئان بووبێت، بەڵکوو ئەو سەلماندنە بە ڕێگەی ژمارەی زۆری چیناوچینی لەبەرکاری زارەکی گەیەنەرانی قورئان بووە.

(ابن الجزري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنَّ الِاعْتِمَادَ فِي نَقْلِ الْقُرْآنِ عَلَى حِفْظِ الْقُلُوبِ وَالصُّدُورِ لَا عَلَى حِفْظِ الْمَصَاحِفِ وَالْكُتُبِ، وَهَذِهِ أَشْرَفُ خَصِيصَةٍ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى لِهَذِهِ الْأُمَّةِ، فَفِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ ... "وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَابًا لَا يَغْسِلُهُ الْمَاءُ، تَقْرَؤُهُ نَائِمًا وَيَقْظَانَ"(٢)، ... وَلَمَّا خَصَّ اللَّهُ تَعَالَى بِحِفْظِهِ مَنْ شَاءَ مِنْ أَهْلِهِ أَقَامَ لَهُ أَئِمَّةً ثِقَاتٍ تَجَرَّدُوا لِتَصْحِيحِهِ وَبَذَلُوا أَنْفُسَهُمْ فِي إِتْقَانِهِ وَتَلَقَّوْهُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَرْفًا حَرْفًا، لَمْ يُهْمِلُوا مِنْهُ حَرَكَةً وَلَا سُكُونًا وَلَا إِثْبَاتًا وَلَا حَذْفًا»(٣).

واتە: پاڵپشت بۆ گەیاندنی قورئان لەبەرکردنی دڵیی بووە، نەك نووسینەوەی لە (مصحف)ەکاندا، ئەمە گەورەترین تایبەتمەندی ڕێزلێگرتنی ئەم ئوممەتە بووە، وەك لە فەرموودەیەکی (قودسی)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: " کتێبێکم بۆ ناردوویتەتە خوارەوە ئاو

---

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١/ ١٥٤) بَاب مَا يذكر فِي المناولة.

(٢) رواه مسلم (٢٨٦٥)، والطيالسي في "مسنده" (١١٧٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٧٧٩٤)، وفي "القضاء والقدر" (٥٨٦).

(٣) "النشر في القراءات العشر" لابن الجزري (١/ ٦).

نایسرِێتەوە و خەوتوو و بەخەبەربوو دەیخوێنێتەوە "، خوای پەروەردگار بەتایبەت کەسانێکی تەرخان کردووە لە ئیمامە متمانەدارەکان کە هەستن بە ڕاگرتنی ڕاست و دروستی خوێندنەوەکەی، لە دەمی پێغەمبەرەوە وەری بگرن پیت بە پیت، هیچ حەرەکە و سکوونێکی پشتگوێ نەخەن.

لەم فەرموودەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هۆکاری ڕاگرتنی مانەوەی قورئان نووسینەوە نییە، تا ئاو بیشواتەوە و نەمێنێت، بەڵکوو لەبەرکردنێکی ئاسانکارە، کە لەبیری خەوتوو و بەخەبەربوو ناچێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾ [القمر: ١٧].
واتە: قورئانمان ئاسانکار کردووە بۆ لەبەرکردن و خوێندنەوە.

سیمای قورئان ئەوەندەی لەبەرکردنە ئەوەندە نووسینەوە نییە، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ [العنكبوت: ٤٩].
واتە: ئایەتەکانی قورئان ڕوون و ئاشکرایە لە سنگی کەسانی خاوەن زانستدا.

وە یەکێك لە هەرە بەڵگە دیارەکان لەسەر ئەوەی کە گرنگیدان بە قورئان بە ڕێگەی لەبەرکردن بووە لە سەردەمی هاوەڵاندا، وە نووسینەوەکان لای چەند کەسێکی دیاریکراو بووە و پارێزراو بووە، وە ڕێژەی زۆری هاوەڵان لەبەرکاری قورئان و هۆکاری مانەوە و پاراستنی قورئان بوون، کاتێك لە شەڕی (یەمامە)دا دژ بە (مسیلمة الكذاب) هاوەڵان زۆر شەهید دەبن، (عمر بن الخطاب) ﷺ وەکوو هەموو کارە دەرکپێکردنەکانی (الملهم)، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيمَا مَضَى قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ فِي أُمَّتِي هَذِهِ مِنْهُمْ فَإِنَّهُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ»[(١)].

واتە: لە گەلانی پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون هەر دەرکپێکردنێکیان هەبوایە ڕاست دەردەچوو، گەر لە گەلەکەمدا کەسێك هەبێت بەو شێوەیە بێت ئەوە (عمر بن الخطاب) دەبێت.

لەم کارەشدا کاتێك هاوەڵان شەهید دەبوون، دەرکی بەوە کرد کە هاوەڵان نیشانەی مانەوەی قورئانن، بە نەمانیان کاریگەری هەیە لەسەر قورئان، بۆیە بیری لەوە کردەوە بە ڕێگەی دووەم

(١) رواه البخاري (٣٤٦٩).

زیاتر گرنگی بە پاراستنی قورئان بدەن، ئەویش نووسینەوەیەتی، بۆیە وتی: «إِنَّ القَتْلَ قَدْ اسْتَحَرَّ يَوْمَ اليَمَامَةِ بِقُرَّاءِ القُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ القَتْلُ بِالقُرَّاءِ بِالمَوَاطِنِ، فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ القُرْآنِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ القُرْآنِ»(١).

واتە: لە شەڕی یەمامەدا زۆرێك لە هەڵگرانی قورئان شەهید بوون، من پێم باشە فەرمان بدەیت بە کۆکردنەوەی قورئان، تاوەکوو زۆری قورئان لەدەست نەچێت.

واتە بەڕێگەی نووسینەوە، نووسینەوەکەش بۆ زیاتر دڵنیابوون بووە، وە گەرنا خۆ چاپ و بڵاوبوونەوە نەبووە، بەڵکوو یەك نووسینەوەی لەسەر کراوە و پارێزراوە لای (أبو بكر الصديق) رضي الله عنه، پاشان ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه، پاشان (حفصة)ی کچی رضي الله عنها، پاشان بۆ لای (عثمان) رضي الله عنه، وە لە سەردەمی ئەودا چەند ژمارەیەکی لێ نووسرایەوە و بۆ شوێنە ناوادەکان نێردرا، بەڵکوو هەر لەو سەردەمەوە ڕێگەی گەیاندن بە کۆڕی لەبەرکردن و دەماودەم بوو، تا ئێستاش بەم جۆرە هەر پارێزراوە و ڕێگەپێدان و بڕوانامەی لەسەر وەردەگیرێت.

## **دووەم:** ئایا نەنووسینەوەی فەرمووده هۆکارە بۆ بەبەڵگەنەبوون؟

دەوترێت: نەنووسینەوەی فەرمووده هۆکاری یەکلانەکەرەوەیە بۆ بەبەڵگەدانان، وە ئەمەش یەکێکە لە پێویستییەکانی بەڵگە (القطع بالثبوت من لوازم الحجية)(٢)، بە نەبوونی نووسینەوە ناکرێتە بەڵگە، وە کارنەکردن لەسەر نووسینەوە مەبەست پێی نەویستنی کردنە بەڵگەیە، وە هەر لەسەر ئەمەش نەوەستاوە، بەڵکوو فەرمان دراوە بە نەنووسینەوە، ئەمەش مەبەست لە پشتییەوە نەگواستنەوەیە و هۆکارە بۆ نەکردنە بەڵگە.

**لە وەڵامدا:** نووسینەوە هەموو هۆکاری بوونە بەڵگە نییە، وەکوو لەمەوپێش سەلماندمان، بەڵکوو بوونە هۆکاری بەڵگە دادوەری و متمانەی تەواوی ڕاوییەکەیە، لەگەڵ پاڵپشتی ژمارەی

---

(١) رواه البخاري (٤٩٨٦)، والترمذي (٣١٠٣)، والنسائي في "الكبرى" (٧٩٤١)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٥٠٦)، وأحمد في "المسند" (٧٦)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٠٢)، وفي "مسند الشاميين" (٣١٩٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٩١)، والطيالسي في "مسنده" (٦٠٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٣٧٢)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٣٠).

(٢) "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٢٤.

زۆر لە گواستنەوەدا (التواتر)، یا بوونی هۆکاری نووسین و یاخود لەبەرکردن، یا پلەی دادوەری و متمانەی ڕاوییەکە، ئەگەر تاکە کەسێکیش بێت.

وە کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی (ئەبو بەکر)دا ﷺ بۆ (مصحف)ێك، نووسراوەکانی قورئان هۆکاری بوونە بەڵگە نەبوون کە ئەمانە قورئانە، وە بگرە نووسینەوەکانیش بەس نەبوو، بەڵکوو لەبەرکردنەکانی هاوەڵان پشتیوان بوو، کەواتە لەبەرکردنەکان پاڵپشتی تەواو بوو.

وە پێغەمبەریش ﷺ قورئانی نەنووسیوەتەوە بە کار و نییەتی بەبەڵگە بوون، بەڵکوو بەڵگەیەتی قورئان بەبێ نووسینەوە داواکراوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ﴾ [آل عمران: ٣٢]، ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ [النساء: ٥٩]، ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ [النور: ٥١]، ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ﴾ [النساء: ١٠٥]، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ﴾ [النساء: ١٣٦]، ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ [المائدة: ٤٨]، ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ﴾ [الأنعام: ١٥٥]. قورئان بە زارەکیش بگەیەنرێت دەبێت جێبەجێ بکرێت.

وە نەنووسینەوەی فەرموودەش لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، وە تەنانەت ڕێگریلێکردنیشی مەبەست پێی نەکردن و نەبوونە بەڵگەش نەبووە، بوونە بەڵگەی فەرموودە بەبێ نووسینەوەش کارێکی جێگیر و دڵنیا بووە لە دیندا، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾ [النجم: ٣، ٤]، ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ [النساء: ٦٤]، ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ [النساء: ٨٠]، ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ [آل عمران: ٣١]، ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ [النساء: ٦٥]، ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣]، ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ [الحشر: ٧]، ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ

﴿ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ [النساء : ١١٣]، «الْحِكْمَةُ: السُّنَّةُ»(١)، ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾ [الأحزاب : ٢١].

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ»(٢)، «إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي»(٣)، «فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي»(٤)، «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الْأَمْرُ مِنْ أَمْرِي مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ فَيَقُولُ لَا نَدْرِي مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللهِ اتَّبَعْنَاهُ»(٥).

---

(١) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (١/ ٨٢) برقم (٦٩)، و "الإبانة الكبرى" لابن بطة (١/ ٣٤٤) برقم (٢١٧)، و "شرح السنة" للبغوي (١/ ٢٠٢)، و "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (٧٠، ٧١).

(٢) رواه أبو داود (٤٦٠٤)، وأحمد في "المسند" (١٧١٧٤)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٢)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٠١)، والمروزي في "السنة" (٢٤٤)، والخطيب في "الكفاية" ص٨، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢٦٤٣)، و المشكاة (١٦٣).

(٣) رواه الدارقطني في "السنن" (٤٦٠٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣١٩) واللفظ له، والبزار في "المسند" (٨٩٩٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٣٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٠)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢٢٩٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٧٦١)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٩٣٧)، و "المشكاة" (١٨٦).

(٤) رواه أبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٣٤٢٧)، وابن ماجه (٤٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٥)، وأحمد في "المسند" (١٧١٤٤)، والدارمي في "سننه" (٩٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٩)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٢١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٣٨)، وفي "الشعب" (٧١١٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٤)، والآجري في "الشريعة" (٨٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٧٣٥، ٣٠٠٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٥٤٩)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٥٠)، "مشكاة المصابيح" (١٦٥).

(٥) رواه أبو داود (٤٦٠٥) واللفظ له، والترمذي (٢٦٦٣)، وابن ماجه (١٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٣)، وأحمد في "المسند" (٢٣٨٧٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣٦٨) وقال: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، ووافقه الذهبي، والطبراني في "الكبير" (٩٣٤)، و "الأوسط" (٨٦٧١)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٦٤١٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٤٤١)، و "الاعتقاد" ص٢٢٨، و "معرفة السنن والآثار" (٥٠)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٠)، والآجري في "الشريعة" (٩٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٨)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢٣٤١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠١)، والروياني في "مسنده" (٧١٦)، والخطيب في "الكفاية" ص١٠، والشافعي في "مسنده" ص١٥١، والحميدي في "مسنده" (٥٦١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٧١٧٢)، و "المشكاة" (١٦٢).

ئەم دەقانە هەمووی داواكاری گوێڕایەڵیكردنی پێغەمبەرە ﷺ، وە داواكاری جێبەجێكردنی فەرمانەكانییەتی بە هەموو شێوەیەك.

## حیكمەتی نووسینەوەی قورئان

زۆر ڕوون و ئاشكرایە بۆ هەموو كەس كە قورئان ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە:

أ- فەرموودەی خوای پەروەردگارە.

ب- موعجیزەی تایبەتی سەلماندنی پێغەمبەرایەتی كۆتا پێغەمبەری خوایە كە (ﷺ)ە هەتا ڕۆژی دوایی.

ت- وە تەحەدداكاری عەرەب و هەموو جیهانی ئادەمیزاد و جنەكانە تا ڕۆژی دوایی، كە سوورەتێك یان ئایەتێك هاوشێوەی قورئان دابرێژن، وەكوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ٨٨﴾ [الإسراء : ٨٨]، ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [البقرة : ٢٣]، ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨﴾ [يونس : ٣٨].

ث- ڕێكخستنی سوورەتەكان و ئایەتەكان (توقيفي)یە، واتە بەو شێوەیە لای خواوە ﷻ فەرمانی پێدراوە، ئەمە بە كۆدەنگی زانایان، لەبەرئەوەی بەو شێوەیەش پێغەمبەر ﷺ پێداچوونەوەی لەلایەن (جبريل)ەوە ﷺ پێكراوە و هەر بەو ڕێكخستنەش پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا خوێندوویەتی، لەبەر ئەوە نووسینەوەی پێویستە.

ج- بنەمای یاسا و سەرچاوەی هەموو بەڵگە شەرعییەكانە و شوێنی گەڕانەوەی هەموو جۆرە ئیجتیهاد و تەفسیر و شیتەڵكردنەوەكان و بنەما عەقیدەییەكانە ... بە تیاچوونی؛ نەمانی هەموو ئەمانەیە.

ح- خوێندنەوەی عیبادەتە، وشە بە وشە، وە داوا کراوە لە نوێژدا بەتایبەت بخوێندرێتەوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [المزمل : ٢٠]، ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ٧٨﴾ [الإسراء : ٧٨].

خ- قورئان وشە و مانای لای خواوەیە ﷻ، پیت و وشەگۆڕینی تێدا قبووڵ ناکرێت.

د- قورئان وادەی پاراستنی دراوە، دەبێت هەموو هۆکارێکی پاراستن بگیرێتە بەر بۆی، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر : ٩].

ذ- فەرمان دراوە بە خوێندنەوەی تەواو و حەقپێدانی لەو بوارەدا، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤﴾ [المزمل : ٤]، ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ [البقرة : ١٢١].

وە باشترین ڕێگەیش بۆ خوێندنەوەی تەندروست و بێ هەڵە؛ نووسینەوەیەتی بە ڕێگەی ڕەسمی پیت و وشەکان، تاوەکوو مەبەست و مانای حەقیقی خۆی بگەیەنێت.

وەکوو (ابن تيمية) رحمه الله لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾ [العلق : ٤، ٥]دا دەڵێت: «وَذَكَرَ التَّعْلِيمَ بِالْقَلَمِ؛ لِأَنَّهُ مُسْتَلْزِمٌ لِتَعْلِيمِ اللَّفْظِ وَالْعِبَارَةِ وَتَعْلِيمُ اللَّفْظِ وَالْعِبَارَةِ مُسْتَلْزِمٌ لِتَعْلِيمِ الْمَعْنَى»[1]، «لِيَسْتَلْزِمَ تَعْلِيمَ الْقَوْلِ وَتَعْلِيمَ الْعِلْمِ الَّذِي فِي الْقَلْبِ»[2].

واتە: کە دەفەرموێت ﴿عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ﴾ باسی فێربوونی بە قەڵەم کردووە، لەبەرئەوەی هۆکاری فێربوونی وشە و داڕشتنە، وە ئەم دوانەیش هۆکاری فێربوونی مانا و مەبەستەکانی ناو دڵە، کەواتە نووسینەوە هۆکاری خوێندنەوەی تەواوە، وە خوێندنەوەی تەواویش هۆکاری مانا و مەبەستی تەواو دەدات بەدەستەوە، وە قورئانیش بۆ ئەم دوو مەبەستە نێردراوەتە خوارەوە، کە (الإعجاز اللفظي والمعنى)یە، موعجیزەی داڕشتنی ڕەوانبێژی و مانا و مەبەستە وورد و نهێنییەکانە.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٣٨٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٣٨).

**ر-** داوا کراوه له تێڕوانین و مەبەستەکانی قورئان، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ [النساء : ٨٢]، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾﴾ [محمد : ٢٤]، کە ئەمەش بەبێ نووسینەوە ئەنجام نادرێت.

**ز-** داوا کراوه لەکاتی خوێندنەوەیدا گوێ بگرن و بێدەنگ بن، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾﴾ [الأعراف : ٢٠٤]، وە مایەی هیدایەتی تەواوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ﴾ [الإسراء : ٩]، وە کۆکراوە و لەخۆگری هەموو پێویستییەکانی زانینە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ [الإسراء : ٨٩]، وە ئاسانکاری خوێندنەوە و لەبەرکردنی تەواوی لەخۆ گرتووە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾ [القمر : ١٧].

پێویستییەکانی ئەمانە لە نووسینەوەدا بەدی دەکرێت، تاوەکوو پارێزراوتر و سەربەخۆتر بێت لە هەموو شتێکی تر.

**س-** قورئان ڕێژەیەکی دیاریکراو و سنوورداره، نووسینەوە هۆکارێکی پێویستە بۆ پاراستنی و سنووری دیاریکراوی؛ کە ئەوەندە وشە و ئایەت و سوورەت و جوزئە.

**ش-** فەرمان بە گەیاندنی قورئان دراوە.

وە فەرماندان بە گەیاندن بە شتێکی دیاریکراو و ناسراو و ناودار دەبێت کە جیاکراوەیی تەواو بەخۆیەوە ببینێت، ئەمانە هەمووی پێویستە بۆ گەیاندنی قورئان لەدوای لەبەرکردن بە ڕێگەی نووسینەوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ [المائدة : ٦٧]، ﴿وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ [الأنعام : ١٩]، ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى﴾ [الأعراف : ٦٨].

ئەمانە و چەندەها هۆکاری تایبەتی دینی تر پاڵپشتی نووسینەوەی قورئانن، هەر لە دانانی ڕێز و قەدر و گەورەیی کە بۆ فەرموودەی پەروەردگاری بوونەوەره، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾﴾ [الحج : ٣٢]، واته: ئەوەی بە

بەها و قەدر و ڕێزەوە بڕوانێتە بەها دینییەکان؛ ئەوە نیشانەی خواپەرستییە لە دڵدا، وە مایەی شیفا و هیدایەت و بەزەییە بۆ ئادەمیزاد، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ۝١٣٨﴾ [آل عمران: ١٣٨]، ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ﴾ [الإسراء: ٨٢]، وە فەرموودەکانی لەخۆگری تەواو و کامڵ و بەهێزی بێ سنوور نیشانەکانییەتی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ [الأنعام: ١١٥]، کەواتە شایستەی لەخۆگرتنی زیاتر لە نووسینەوە و گرنگیپێدانییەتی، بۆیە تەنانەت ئەرکی نووسینەوەیشی کەوتووەتە ئەستۆی پێغەمبەر ﷺ، بۆ زیاتر پلەوپایە بلندی موعجیزەکەی خوی: ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ﴾ [الأعراف: ١٥٨]، کە نەخوێندەواریشە و دەبێت قورئان بە نووسراوەیی بگەیەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا تەورات و ئینجیل بە نووسراوەیی دابەزیوە بۆ پێغەمبەر (موسا و عیسا) عليهما السلام، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «... اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، ... »[(١)]، ئەم ئەرکانە نەکەوتووەتە ئەستۆیان.

## حیکمەتی نەنووسینەوەی فەرمووده
## لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە هاوشێوەی قورئان

لەگەڵ ئەو هەموو خەمخۆری و هۆکارگرتنەبەرە بۆ نووسینەوەی قورئان و لەبەرکردنی، فەرموودە کە شیتەڵکار و یەکلاکەرەوە و ڕوونکەرەوەی قورئانە؛ یەکێك لەو هۆکارانە ناگیرێتە بەر لە ئاستیدا، بێگومان دەبێت هۆکار و ڕەچاوکار و سوودمەندییەکی تایبەتی هەبێت بۆی لەم بوارەدا، وە لەبەرامبەریشدا زیان بە فەرمـوودە نەگات، بۆیە زانایان بۆ دەرککردن بەو هۆکارانە و

---

(١) رواه البخاري (٣٤٠٩)، ومسلم (٢٦٥٢) واللفظ له، وأبو داود (٤٧٠١)، والترمذي (٢١٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٠٦٥)، وابن ماجه (٨٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٩)، وأحمد في "المسند" (٧٥٨٨)، والدارمي في "الرد على الجهمية" (٢٩٣)، والطبراني في "مسند الشاميين" (٣٠٦٠)، والبزار في "المسند" (٧٨٨٨)، وابن خزيمة في "التوحيد" (١/ ١٢٠)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٨٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٥٢١)، والبيهقي في "الشعب" (١٨١)، وفي "القضاء والقدر" (١٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٦٩٣)، والآجري في "الشريعة" (٣٥٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٦٨).

حیکمەتی نەنووسینەوەی فەرموودە لەو سەرەتایەدا دەگێڕنەوە بۆ ئەم خاڵانە:

**أ-** فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ، وە خوێندنەوەی عیبادەت نییە، وە لەناو نوێژیشدا ناخوێندرێت.

**ب-** کاری فەرموودە شیکار و ڕوونکردنەوەیە، وە دەبێت بگەڕێتەوە سەر قورئان.

**ت-** لەڕووی ڕێژە و چەندێتییەوە لە ژمارە نایەت، لەبەر کاری فەرموودە کە شیکار و شەرحە، بێگومان ئەمەش بۆخۆی نووسینەوە و کۆکردنەوە و ڕێکخستنی زۆر زەحمەتە و بە چەند کەسێکی دیاریکراو ناکرێت، وەکوو دەبینین ژمارەی فەرموودەناسەکان (المحدثون) لەپاش هاوەڵانیشەوە هاتوون چەندە زۆرن، بەپێچەوانەی قورئانەوە.

**ث-** فەرموودە پێویست بە ڕێکخستن ناکات وەکوو قورئان.

**ج-** فەرموودە موعجیزەی سەرەکی پێغەمبەر ﷺ نییە و تەحەددای چۆنێتی و دارِشتن و بوونی نییە.

**ح-** فەرموودە مەرجی پاراستنی پیت و وشە و دارِشتنی نییە، بەڵکوو بە ڕێگەی مانایش توانای گەیاندنی هەیە و مەبەستی خۆی دەگەیەنێت.

**خ-** کارێکی زۆر ئەستەمە هەرچی قسە و کار و هەڵسوکەوتێکی پێغەمبەر ﷺ هەیە لە یەك کاتدا ئاگادار بکرێنەوە لەسەری و کۆبکرێتەوە و بنووسرێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵییەی هاوەڵان بە ژیانی ڕۆژانەیان و خاوەن ماڵ و منداڵ و سەرقاڵبوون بە جیهادکردن و بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی دین، وە لەگەڵ سەرەتابوونی هۆکارەکانی نووسین و پێویستییەکانی لەناو گەلێکی نەخوێندەواری وەك عەرەبدا.

**د-** وە تەنانەت ئەگەر کۆبکرایەتەوە و بشنووسرایەتەوە؛ ئەگەر لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیشدا بوایە ئەوا دەبووە هۆکاری ئەوەی هەر فەرموودەو پاشماوەیەکی پێغەمبەر ﷺ کە پاش ئەوان بوونی ببوایە؛ ڕەت بکرایەتەوە و وەرنەگیرایە، بە بەڵگەی ئەوەی وەکوو ئەو ڕیوایەتەی هەیە (ئەبو بەکر) ﷺ فەرموودەی کۆنەکردەوە و وتی: «أَوَ يَكُوْنُ قَدْ بَقِيَ حَدِيْثٌ لَمْ أَجِدْهُ، فَيُقَالُ: لَوْ كَانَ قَالَهُ رَسُوْلُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا خَفِيَ عَلَى أَبِيْ بَكْرٍ»[1].

---

(١) "كنز العمال" للشاذلي (١٠/ ٢٨٥) برقم (٢٩٤٦٠)، و "جامع الأحاديث" للسيوطي (٢٥/ ١٢١)، و "الأنوار الكاشفة" للمعلمي اليماني ص٣٧، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٠٧، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٦٧.

واتە: دەترسم لەوەی فەرموودەی تر مابێت من نەمبیستبێت و بڵێن: ئەگەر فەرموودە بوایە ئەوا لە (ئەبو بەکر) شاراوە نەدەبوو.

ذ- فەرموودە ئەوەندە بڵاو بوو، وە هۆکاری گەیاندنی ئاسان بوو، نەدەوترا لە نەمانی هاوەڵاندا دەترسین ببێتە هۆکاری نەمانی فەرموودە، وەکوو بۆ لەبەرکارەکانی قورئان وایان دەوت.

ر- کۆکردنەوەی فەرموودە پێش تەواوبوون لە بەدیهێنانی متمانە لەسەر کۆکردنەوە و تەواوکاری نووسینەوەی قورئان و توندوتۆڵکردنی؛ دەبووە هۆکاری تێکەڵبوون و ڕووکردنە فەرموودە و بەمانەش لە قەدر و بەهای قورئان کەم دەبووەوە و سەرچاوە ون دەبوو، وەکوو لە فەرموودەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ»(١).

واتە: مەنووسنەوە لە من بێجگە لە قورئان نەبێت، ئەوەی جگە لە قورئانی لە منەوە نووسیوەتەوە با بیسڕێتەوە.

## - فەرموودە نووسینەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەنێوان ڕێگری و ڕێگە پێداندا:

سەرەڕای ئەو هەموو خوێندنەوە و ڕەچاوکردنە بۆ نووسینەوەی قورئان و پاراستنی، وە نەنووسینەوەی دیار بۆ فەرموودە، هێشتا هەست بەوە دەکرێت کە فەرموودە پشتگوێ نەخراوە و گرنگی و بایەخی تایبەتی تا ڕێژەیەکی دیاریکراو پێدراوە، جارێك بە ڕێگەپێدان بە نووسینەوە و جارێك هاندان بە گەیاندن، وە لەلایەکی تریشەوە هەستکردن بە ساردییەك و هەڕەشەکردن لە گەیاندنێك کە بە شێوەی زۆر پێویستی خۆی نەبێت، وە لە لایەکی تریشەوە خۆپاراستنێکی تایبەتی لەلایەن هاوەڵانەوە لەسەری.

### ١. فەرمان و ڕیوایەتەکان لەسەر نووسینەوە:

أ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: «مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدٌ

(١) رواه مسلم (٣٠٠٤)، والنسائي في "الكبرى" (٧٩٥٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٤)، وأحمد في "المسند" (١١٣٤٤)، والدارمي في "السنن" (٤٦٤)، والحاكم في "المستدرك" (٤٣٧)، والبزار في "المسند" (٨٧٦٣)، والبيهقي في "المدخل" (٧٢٤)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٢٨٨)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٣٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٩٤).

أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ»(١).

واتە: (ئەبو هورەیرە) ﵁ دەیوت: هیچ كەسێك لە هاوەڵان هێندەی من فەرموودەی لا نییە، جگە لە (عبدالله ی كوڕی عەمری كوڕی عاص) نەبێت، ئەو فەرموودەكانی دەنووسییەوە، من نەم دەنووسییەوە.

**ب-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: «كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ حِفْظَهُ، فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ، وَالرِّضَا، فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَى فِيهِ، فَقَالَ: "اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلَّا حَقٌّ"»(٢).

واتە: (عبدالله ی كوڕی عەمر) ﵁ دەڵێت: من هەرشتێكم لە پێغەمبەرەوە ﷺ ببیستایە دەمنووسی، دەمویست لەبەری بكەم، قورەیش ڕێگری لێ دەكردم، وتیان: هەموو شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەنووسیت، ئەو ئادەمیزادە قسە دەكات لەكاتی تووڕەبوون و ڕازیبووندا، منیش نووسینم واز لێهێنا و بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەنجەی ئاماژەی بۆ دەمی كرد و فەرمووی: بنووسە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ شتێك لێوەی نایەتە دەرەوە جگە لە حەق نەبێت.

**ت-** پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێككەوتننامەكانی حودەیبیە و نێوان جوولەكەكان و دەستووری مەدینە و نامەی بۆ سەركردەكانی دونیا لە (كیسرا) و (قەیسەر) و (موقەوقەسی) میسر و ... هەموو نووسیوە، كە زۆری بە یاسا و بنەمای كاركردن هەژمار دەكرێت.

(١) رواه البخاري (١١٣)، والدارمي في "السنن" (٥٠٠)، والبيهقي في "المدخل" (٧٤٨)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٧١٣٦).

(٢) رواه أبو داود (٣٦٤٦)، وأحمد في "المسند" (٦٨٠٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، ورواه الدارمي في "سننه" (٥٠١)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٩)، والطبراني في "الكبير" (١٤٢٦٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٤٢٨)، والبيهقي في "المدخل" (٧٥٥)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٨٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٣٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (١١٩٦).

وە تەنانەت بۆ تاکەکەسیش گەر پێویست بووبێت فەرمانی نووسینەوەی داوە، وەکوو وتارەکەی (عام الفتح) کاتی گرتنەوەی مەککە، کە پێکهاتبوو لە یاسا و دەستوورە گشتییەکان، پیاوێکی یەمەنی ئامادەبوو تیایدا: «... فَقَامَ أَبُو شَاهٍ - رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ اليَمَنِ - فَقَالَ: اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "اكْتُبُوا لِأَبِي شَاهٍ"»(١).

واتە: (أبو شاه) داوای کرد ئەو وتارەی بۆ بنووسێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بینووسنەوە بۆ (أبو شاه).

**ث-** وە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشییەکەی پێش وەفاتیدا فەرمووی: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا»(٢).

واتە: پەڕاوێکم بۆ بێنن نووسینێکتان بۆ بنووسم کە لەپاش من گومڕا نەبن بەهیچ شێوەیەك.

**ج-** وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «قَيِّدُوا الْعِلْمَ بِالْكِتَابِ»(٣).

واتە: زانست ببەستنەوە بە نووسین.

**ح-** وە هەندێك ڕیوایەتی تر کـراوە بە بەڵگە، بەڵام لای زانـایـان پلەی (صحيح) و متمانەیان

---

(١) رواه البخاري (٢٤٣٤، ٦٨٨٠)، ومسلم (١٣٥٥)، وأبو داود (٢٠١٧)، والترمذي (٢٦٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٢٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٧١٥)، وأحمد في "المسند" (٧٢٤٢)، والدارقطني في "السنن" (٣١٤٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٩٢١)، والفاكهي في "أخبار مكة" (١٤٤٢)، وأبو عوانة في "مستخرجه" (٣٧٣٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٦٠٣٩)، و "الشعب" (٣٧١٩)، وابن الجارود في "المنتقى" (٥٠٨)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٨٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٩٤)، والخطيب في "الكفاية" ص٥٣.

(٢) رواه البخاري (٣٠٥٣)، ومسلم (١٦٣٧)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٥٩٧)، وأحمد في "المسند" (١٩٣٥)، والفاكهي في "أخبار مكة" (١٧٥٣)، والبزار في "المسند" (٤٨٢٦)، والطبراني في "الكبير" (١٠٩٦١)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٩٩٢)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٤٠٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٧٥٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٧٤٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧/ ١٣٦٧)، والحميدي في "مسنده" (٥٣٦).

(٣) رواه ابن عبد البر في "الجامع" (٣٩٥) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، و الشهاب القضاعي في "مسنده" (٦٣٧)، والخطيب في "تأريخه" (١٠/ ٤٦)، وفي "المخلصيات" لمحمد بن عبدالرحمن المخلص (٥٥٦)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٨/ ٣٩٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٠٢٦)، و "صحيح الجامع الصغير" (٤٤٣٤).

وەرنەگرتووە، لەبەرئەوە بەس ئاماژەیان پێدەدەین، لەوانە: «اسْتَعِنْ عَلَى حِفْظِكَ بِيَمِينِكَ»(١)، «اكْتُبُوا وَلَا حَرَجَ»(٢)، «وَكِتَابُ عَمْرُو بْن حَزْم الأَنْصَارِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ»(٣)، «هَذِهِ أَحَادِيثُ سَمِعْتُهَا وَكَتَبْتُهَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ عَرَضْتُهَا عَلَيْهِ»(٤).

### ٢. فەرمان و ڕیوایەتەکان لەسەر نەنووسینەوە:

أ- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «لَا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ»(٥).

واتە: هیچ لە منەوە مەنووسنەوە، ئەوەی شتێکی لە منەوە نووسیوەتەوە بێجگە لە قورئان با بیسڕێتەوە.

---

(١) "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٦٥، و" الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي ص٥٠، وقد أخرجه الترمذي أَيْضًا من طريق أبي هريرة، انظر "توضيح الأفكار" (٢/ ٣٥٣)، وفي "لسان الميزان" لابن حجر (٤/ ٢١)، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٠٤.

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (٤٤١٠)، والهيثمي في "مجمع الزوائد" (٦٧٧)، وابن شاهين في "ناسخ الحديث" (٦٢٦)، والرامهرمزي في "المحدث الفاصل" (٣٦٩)، وفي "تدريب الراوي" للسيوطي ص٢٨٦، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٧٢، و "إعلام العالم" لابن الجوزي (٣٥٤)، و "السنة ومكانتها" لعبدالحليم محمود ص٤٤، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٤٣، وانظر "توضيح الأفكار" (٢/ ٣٥٣)، وقد ضَعَّفَ (السيد رشيد رضا) صاحب "المنار" هذا الحديث، انظر مجلة "المنار" (١٠/ ٧٦٣)، وفي "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٠٤.

(٣) رواه النسائي في "الصغرى" (٤٨٥٣)، والدارمي في "سننه" (١٦٦١) وضعفه محققه (الداراني)، والدارقطني في "السنن" (٢٧٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٥٥٩)، والحاكم في "المستدرك" (١٤٤٧)، والبيهقي في "الصغير" (٣٠١٧)، و "الكبير" (٤٠٩)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٣٠٨٤)، وضعفه الألباني في "صحيح وضعيف سنن النسائي" (٤٨٥٣).

(٤) رواه البخاري في "التأريخ الكبير" (٢٨٥٨)، والبيهقي في "المدخل" (٧٥٧)، وفي "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٩٥، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٩٨)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٧٣/ ٣٦٦)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٨)، و "السنة ومكانتها" لعبدالحميد محمود ص٤٥، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٤٦، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٢٠.

(٥) رواه مسلم (٣٠٠٤)، وسبق تخريجه ص٣٧.

**ب-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَنَا أَنْ لَا نَكْتُبَ شَيْئًا مِنْ حَدِيثِهِ» فَمَحَاهُ[١].

**واته: (زەیدی کوڕی ثابت) ﷺ کاتێك چووه لای (معاوية) ﷺ پرسیاری فەرموودەیەکی لێکرد و وەڵامی دایەوە، ئەویش فەرمانی دا بە نووسینەوەی، (زەید) وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداین کە هیچ شتێك لە فەرموودەکانی نەنووسینەوە، ئەوکات سڕییەوە.**

**ت-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: «مَا كُنَّا نَكْتُبُ غَيْرَ التَّشَهُّدِ، وَالْقُرْآنِ»[٢].

**واته: ئێمە هیچمان نەدەنووسییەوە بێجگە لە (تەحیات) خوێندنی ناو نوێژ، وە قورئان نەبێت.**

**ث-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: «اسْتَأْذَنَّا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الكِتَابَةِ فَلَمْ يَأْذَنْ لَنَا»[٣].

**واته: داوای ڕێپێدانمان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نووسینەوەی، ڕێگەی پێ نەداین.**

**ج-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: كُنَّا قُعُودًا نَكْتُبُ مَا نَسْمَعُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: «مَا هَذَا تَكْتُبُونَ؟» فَقُلْنَا: مَا نَسْمَعُ مِنْكَ، فَقَالَ: «أَكِتَابٌ مَعَ كِتَابِ اللهِ؟» فَقُلْنَا: مَا نَسْمَعُ، فَقَالَ: «أَكِتَابٌ غَيْرُ كِتَابِ اللهِ امْحِضُوا كِتَابَ اللهِ، وَأَخْلِصُوهُ» قَالَ: فَجَمَعْنَا مَا كَتَبْنَا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ أَحْرَقْنَاهُ بِالنَّارِ، ...»[٤].

**واته: (ئەبو هورەیرە) ﷺ دەڵێت: دانیشتبووین فەرموودەکانی پێغەمبەرمان دەنووسییەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، فەرمووی: ئەمە چی دەنووسنەوە؟ وتمان: ئەوەی لە تۆی دەبیستین، فەرمووی: ئەوە کتێبێکی تر هەیە لەگەڵ کتێبەکەی خوا؟ وتمان: نابیستین، فەرمووی: کتێبێکی تر**

(١) رواه أبو داود (٣٦٤٧)، والنسائي في "المدخل" (٧٢٩)، وأحمد في "المسند" (٢١٥٧٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لانقطاعه، وكذا في تحقيقه لسنن أبي داود، ورواه ابن عبد البر في "الجامع" (٣٣٦)، وضعفه الألباني في "صحيح وضعيف سنن أبي داود" (٣٦٤٧).

(٢) رواه أبو داود (٣٦٤٨)، وقال الألباني: شاذ.

(٣) رواه الترمذي (٢٦٦٥)، وصححه الألباني.

(٤) رواه أحمد في "المسند" (١١٠٩٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

هەیە بێجگە لە كتێبی خوا؟ كتێبی خوا ڕزگار كەن، وتی: ئێمەش هەموویمان كۆكردەوە لە یەك شوێندا و سووتانمان بە ئاگر.

**ح-** عَن مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ الله عَنْهُ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَكْتُبُ شَيْئًا مِنَ الْحَدِيثِ، فَقَالَ: «**مَا هَذَا يَا مُعَاذُ؟**»، قُلْنَا سَمِعْنَاهُ مِنْكَ يَا رَسُولَ اللهَّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**يَكْفِيكُمْ هَذَا الْقُرْآنُ مِمَّا سِوَاهُ**»، فَمَا كَتَبْنَا شَيْئًا بَعْدُ[1].

**واتە: پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، ئێمە هەندێك فەرموودەمان دەنووسییەوە، فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتمان: ئەوانەی لە تۆمانەوە بیستووە، فەرمووی: ئەم قورئانەتان بەسە لە هەموو شتێك، پاشان دوای ئەوە هیچ شتێكمان نەدەنووسییەوە.**

وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ، قَالَا: خَرَجَ رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعْصُوبًا رَأْسُهُ، فَرَقِيَ دَرَجَاتِ الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: «**مَا هَذِهِ الْكُتُبُ الَّتِي بَلَغَنِي أَنَّكُمْ تَكْتُبُونَهَا؟ أَكِتَابٌ مَعَ كِتَابِ اللهَّ؟** ...»[2].

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، سەری بەستبوو، چووە سەر پلەكانی مینبەر و فەرمووی: ئەو نووسینەوانە چین پێم گەیشتووە كە ئێوە دەینووسنەوە؟ ئەوە كتێبێكی تر هەیە لەگەڵ كتێبی خوادا؟**

(١) أخرجه إسحاق كما في "المطالب العالية" لابن حجر (١٢/ ٦١٠) برقم (٣٠٣٢)، وقال ابن حجر: هذا منقطع، وفي "إتحاف الخيرة" لأبو العباس البوصيري (٣٦٢)، وفي "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٣٧.

(٢) رواه الطبراني في "الأوسط" (٧٥١٤)، وقال الهيثمي في "مجمع الزوائد" (٢/ ٤٢٠): وهذا إسناد ضعيف، فيه عيسى بن ميمون، وهو متروك، وقال البخاري في "الكبير" (٦/ ٤٠١ – ٤٠٢): منكر الحديث، وفي "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٣٨، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم ص٥٣: وقال: ضعيفٌ جداً.

## بۆچوونی زانایان لەسەر یەکلابوونەوەی ئەم بابەتە

زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر یەکلابوونەوەی ئەم بابەتە و تێڕوانینیان بۆ خوێندنەوەی ئەم دوو جۆرە بەڵگانە و کۆکردنەوەیان لە چوارچێوەی مانایەکدا، وە هەموو بۆچوونەکانیان لە دوو جۆر خوێندنەوەدا کۆدەبێتەوە:

**یەکەم:** کۆکردنەوەی هەردوو جۆرە فەرموودەکان لە مانا و مەبەستێکی دیاریکراودا.

ئەمە پێی دەوترێت (الجمع بين الأحاديث)، کە یەکێکە لە ڕێگاکانی یەکخستنی دوو جۆرەکانی بەڵگەی جیاوازی دژبەیەك (تعارض الأدلة)، ئەمە ڕێگایەکە دەگیرێتە بەر بۆ یەکلاکردنەوەی تێگەیشتنێکی ئاڵۆز لەنێوان بەڵگەکاندا، لێرەدا خوێندنەوەی لەژێر تێگەیشتنە گشتییەکاندا و مەبەستە شەرعییەکاندا (المفهوم العلمي والمقاصد الشرعية) بۆ دەکرێت، بە گەیشتن بۆ مەبەستێکی ڕەچاوکراوی شەرعی، کە لە ئەنجامدا بەم هۆکارەوە کار لەسەر هەموو بەڵگەکان دەکرێت، خۆی بۆ خۆی ئەمە داواکارییەکی دینییە، بەوەی کە هیچ بەڵگەیەك پەراوێز نەخرێت، بنەما لە دینداریدا کارکردنە بە هەموو بەڵگەیەك گەر (صحيح) بوو، وە یاسای کۆکردنەوەی بەڵگەکان (الجمع) بۆ ئەم مەبەستە دانراوە لەلایەن زانایانەوە.

**لە ڕوانگەی ئەم یاسایەوە (الجمع بين الأدلة)، لەسەر ئەم بابەتە زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:**

١- ڕێگرییەکانی نووسینەوەی فەرموودە بە شێوەیەکی گشتییە (العام)، وە ڕێگەپێدانەکان تایبەتن (الخاص)، بەو مانایەی کەسە تایبەتەکان کە خاوەنی شارەزاییەکی تەواون بەسەر قورئان و فەرموودەدا و نووسین و چاوکراوەییەکی باشیان هەیە و دڵنیاین لەسەریان کە فەرموودە بنووسنەوە تێکەڵ و لێتێکچوونیان بۆ دروست نابێت لەنێوان قورئان و فەرموودەکاندا و قورئان سەلامەت دەبێت، لەکاتێکیشدا قورئان بەردەوام دادەبەزێت و دەنووسرێتەوە و تەواو نەبووە، وە دابەزینی پێویستی بە پاراستنێك و گرنگییەکی تایبەتی هەیە تا دەناسرێت و دەردەکەوێت، ئەمە لای کەسە تایبەتەکانی وەکوو (عبد الله بن عمرو) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ... بۆ ئەم کەسانە ڕێگەپێدراوە.

بەڵام كەسە گشتییەكان لەبەرئەوەی عەرەب بە زۆرینە نەخوێندەوار بوون و نووسین و خوێندنەوە لە قۆناغی سەرەتایی گەشەپێداندا بووە؛ باش وایە ڕێیان لێ بگیرێت لە نووسینەوەی فەرمووده، تاوەكوو قورئان تایبەت بكرێت بە نووسینەوە و گرنگیپێدان بە شێوەیەكی دیار كە هیچ شتێك لە بەرامبەریدا بوونی نەبێت، ئەمە هۆكارە بۆ زیاتر دڵنیابوونی پاراستنی قورئان و ناسینی لای گشتی خەڵكی.

هەروەكوو ڕیوایەتەكەی (أبو هريرة) ﷺ ئاماژە بۆ ئەمە دەكات كە فەرمووی: «"أَكِتَابٌ مَعَ كِتَابِ اللَّهِ؟" ... فَقَالَ: "... امْحَضُوا كِتَابَ اللَّهِ، وَأَخْلِصُوهُ" ...»[(١)]، وە ڕیوایەتەكەی (أبو سعيد الخدري) ﷺ : «وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ»[(٢)]، وە ڕیوایەتی: «اسْتَأْذَنَّا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الكِتَابَةِ فَلَمْ يَأْذَنْ لَنَا»[(٣)].

وە ڕیوایەتەكەی خەلیفەی ڕاشید (عمر بن الخطاب) ﷺ كە پرسی كرد بە هاوەڵان لەسەر نووسینەوەی فەرمووده و ئیستیخارەی كرد و پاشان پەشیمان بووەوە: «عَنْ عُرْوَةَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ السُّنَنَ فَاسْتَفْتَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ فَأَشَارُوا عَلَيْهِ بِأَنْ يَكْتُبَهَا فَطَفِقَ عُمَرُ يَسْتَخِيرُ اللهَ فِيهَا شَهْرًا، ثُمَّ أَصْبَحَ يَوْمًا وَقَدْ عَزَمَ اللهُ لَهُ فَقَالَ: "إِنِّي كُنْتِ أُرِيدُ أَنْ أَكْتُبَ السُّنَنَ وَإِنِّي ذَكَرْتُ قَوْمًا كَانُوا قَبْلَكُمْ كَتَبُوا كُتُبًا فَأَكَبُّوا عَلَيْهَا وَتَرَكُوا كِتَابَ اللهِ وَإِنِّي وَاللهِ لَا أَشُوبُ كِتَابَ اللهِ بِشَيْءٍ أَبَدًا"»، وَفِي رِوَايَةٍ: «لَا أَلْبَسُ كِتَابَ اللهِ بِشَيْءٍ أَبَدًا»[(٤)].

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (١١٠٩٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٢) رواه مسلم (٣٠٠٤)، وسبق تخريجه ص٣٧.

(٣) رواه الترمذي (٢٦٦٥)، وصححه الألباني.

(٤) رواه عبدالرزاق في "جامع معمر بن راشد" (٧٣١)، والبيهقي في "المدخل" (٧٣١)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٤٣)، وفي "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٤٩، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤٩٥)، و "كنز العمال" للشاذلي (٢٩٤٧٤)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ١٠٣)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٠٨، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٦٨، و "كتابة السنة النبوية" لأحمد بن هاشم ص٣٤، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣١٠، وقال ابن الوزير في "الأنوار الكاشفة" ص٣٨: (منقطع)، لأن عروة لم يدرك عمر، كما في =

وتی: من ویستم فەرموودەكان بنووسمەوە، بەڵام یادی كەسانێكم كەوتەوە كە پێش ئێوە كتێبێكیان نووسییەوە و گرنگییان پێدا و كتێبی خوایان پشتگوێ خست، وە منیش سوێند بە خوا كتێبی خوا تێكەڵ بە هیچ ناكەم.

وە قسەكەی (أبو سعيد الخدري) ﷺ كە داوای لێكرا بۆیان بنووسێتەوە، وتی: «لَا نُكْتِبُكُمْ وَلَا نَجْعَلُهَا مَصَاحِفَ كَانَ رَسُولُ اللهِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُنَا، فَنَحْفَظُ فَاحْفَظُوا عَنَّا كَمَا كُنَّا نَحْفَظُ عَنْ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[١].

واتە: نانووسینەوە و نایكەین بە قورئانێك (مصحف)، پێغەمبەر ﷺ فەرموودەی بۆ دەوتین و لەبەرمان دەكرد، ئێوەش لەبەری كەن وەكوو چۆن ئێمە لەبەرمان دەكرد لە پێغەمبەرەكەتانەوە ﷺ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: «إِنَّا لَا نَكْتُبُ الْعِلْمَ وَلَا نُكْتِبُهُ»[٢].

واتە: زانست نانووسینەوە و بۆ كەسیشی نانووسین.

ئەمە بۆچوونی ئیمام (ابن قتيبة)یە رَحِمَهُ ٱللَّهُ كە دەڵێت: «فَلَمَّا خَشِيَ عَلَيْهِمُ الْغَلَطَ فِيمَا يَكْتُبُونَ نَهَاهُمْ، وَلَمَّا أَمِنَ عَلَى عَبْدِ اللهِّ بْنِ عَمْرٍو ذَلِكَ، أَذِنَ لَهُ»[٣].

= "تهذيب التهذيب" (٧/ ١٥٨)، وقال ص٤١: رواية ابن عبد البر عن مالك معضل، وقد رواه الخطيب من طريق آخر عن عروة بن الزبير، عن عبد الله بن عمر، عن عمر رضي الله عنه، أي بزيادة (عبد الله) (ص٤٩) من "تقييد العلم" بنحوه، وإسناده صحيح.

(١) رواه البيهقي في "المدخل" (٧٢٧)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٣٩)، والرامهرمزي في "المحدث الفاصل" (٣٧٩)، وفي "التأريخ الكبير" لابن أبي خيثمة (٣/ ١٣٩)، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٣٦، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٠٩، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص١٧.

(٢) رواه عبدالرزاق في "جامع معمر بن راشد" (١١/ ٢٥٨)، والبيهقي في "المدخل" (٧٣٤)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٤٤)، وفي "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٤١، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٠٩، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٧٠، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣١٣.

(٣) "تأويل مختلف الحديث" لابن قتيبة ص٤١٢، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٥٩، و "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص٦٠، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص١٧، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم ص٥٨.

واته: کاتێك ترساوه لەوەی هەڵە دروست ببێت لە نووسینەکانیاندا؛ ڕێگری کردووه لێیان، وه کاتێك متمانەی بە (عبدالله ی کوڕی عەمر) بووه ڕێگەی داوه بە نووسین.

**٢-** هەندێك لە زانایان دەڵێن: ڕێگرییەکە لەکاتی سەرەتایی دابەزینی قورئاندا بووه، لە ترسی لێتێکچوون و تێکەڵبوون، وه ڕێگەپێدانەکەش لە کاتی تر و دوای ئەوه بووه.

قَالَ الْسّيوطِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ: « وَقِيلَ: النَّهْيُ خَاصٌّ بِوَقْتِ نُزُولِ الْقُرْآنِ خَشْيَةَ الْتِبَاسِهِ، وَالْأَذْنُ فِي غَيْرِهِ. وَمِنْهُمْ مَنْ أَعَلَّ حَدِيثَ أَبِي سَعِيدٍ»[1]. وه هەندێکیش ڕەخنە دەگرن لە ڕیوایەتەکەی (أبو سعيد الخدري) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

وَقِيلَ: «لِئَلَّا يُضَاهَى بِكِتَابِ اللهِ تَعَالَى غَيْرُهُ، أَوْ يُشْتَغَلَ عَنِ الْقُرْآنِ بِسِوَاهُ»[2].

یاخود ڕێگرییەکە لەبەرئەوه بووه کە گرنگی نەدەن بە بێجگە لە قورئان و پێوەی سەرقاڵ بن و قورئان پشتگوێ بخەن.

**لەو زانایانەش کە خاوەنی ئەم ڕایەن:**

- القرطبي رَحِمَهُ اللَّهُ في "تفسيرة" (١١/ ٢٠٧).
- السمعاني رَحِمَهُ اللَّهُ في "أدب الاملاء والاستملاء" ص١٤٦.
- الذهبي رَحِمَهُ اللَّهُ في "سير أعلام النبلاء" (٣/ ١١).
- الزركشي رَحِمَهُ اللَّهُ في "النكت على مقدمة ابن صلاح" (٣/ ٥٥٨).

**٣-** وه هەندێك دەڵێن: وَقِيلَ: «الْمُرَادُ النَّهْيُ عَنْ كِتَابَةِ الْحَدِيثِ مَعَ الْقُرْآنِ فِي صَحِيفَةٍ وَاحِدَةٍ»[3].

---

(١) "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤٩٥)، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٤١.

(٢) "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٥٧، و "النكت على مقدمة ابن صلاح" للزركشي (٣/ ٥٦٠)، و "الجامع" لابن عبد البر (١/ ٨٢)، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٣٠، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٣٩، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣١٥.

(٣) "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤٩٥)، و "معالم السنن" للخطابي (٤/ ١٨٤)، و "شرح النووي على مسلم" (١٨/ ١٣٠)، و "عون المعبود" للعظيم آبادي (١٠/ ٥٨)، و "إكمال المعلم بفوائد مسلم" للقاضي عياض (٨/ ٥٥٣)، و "الرد على من =

واته: مەبەست لە ڕێگریکردنی نووسینی فەرمووده ئەوه بووه كه لەگەڵ قورئان لە یەك شوێندا (لە یەك پەڕاودا) نەنووسرێت.

**٤. وه هەندێكی تر دەڵێن:** «نَهَى عَنْهُ حِينَ خِيفَ اخْتِلَاطُهُ بِالْقُرْآنِ، وَأَذِنَ فِيهِ حِينَ أَمِنَ ذَلِكَ، فَيَكُونُ النَّهْيُ مَنْسُوخًا»(١).

**واته:** مەبەست لە ڕێگریکردنی كاتێك بووه كه ترسی ئەوه هەبووه تێكەڵ بێت لەگەڵ قورئاندا، بەڵام كاتێك پێغەمبەر ﷺ متمانەی هەبووه كه تێكەڵ نابێت؛ ڕێگەی پێ داون.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** «وَهَذَا كَانَ فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ خَشْيَةَ أَنْ يَخْتَلِطَ الْوَحْيُ الَّذِي يُتْلَى بِالْوَحْيِ الَّذِي لَا يُتْلَى»(٢).

**واته:** ئەمە كاتی سەرەتای ئیسلام بووه، كه ترسی ئەوه هەبووه وەحییەك كه دەخوێندرێتەوه تێكەڵ بێت به وەحییەك كه ناخوێندرێتەوه، واته سوننەت.

**٥.** وَقِيلَ: «وَقِيلَ النَّهْيُ خَاصٌّ بِمَنْ خُشِيَ مِنْهُ الِاتِّكَالُ عَلَى الْكِتَابَةِ دُونَ الْحِفْظِ وَالْإِذْنُ لِمَنْ أُمِنَ مِنْهُ ذَلِكَ»(٣).

---

= ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٥٨، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٢٩، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٤١، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٠٨، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم ص٥٩.

(١) "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤٩٥)، و "فتح المغيث" للسخاوي (٣/ ٣٩)، و "علوم الحديث" لابن صلاح ص١٦١، و "شرح النووي على مسلم" (١/ ٢٤٥)، و "حاشية محمد فؤاد عبدالباقي على صحيح مسلم" (٤/ ٢٢٩٨)، و "التقريب والتيسير" للنووي ص٦٧، و "شرح نخبة الفكر" للملا القاري ص٧٩٩، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٦٠، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٤١.

(٢) "زاد المعاد في هدي خير العباد" (٣/ ٤٠٢).

(٣) "فتح المغيث" للسخاوي (٣/ ٤٠)، و "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٢٠٨)، و "إرشاد الساري" للقسطلاني (١/ ٢٠٧)، و "فيض القدير" للمناوي (٤/ ٥٣٠)، و "عون المعبود" للعظيم آبادي (١٠/ ٥٩)، و "تحفة الأحوذي" للمباركفوري (٧/ ٣٥٩)، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٤٠، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم ص٢٥.

واتە: ڕێگرییەکە تایبەتە بە کەسێك کە پاڵ بداتەوە لەسەر نووسین و لەبەری نەکات، وە ڕێگەپێدانەکە بۆ کەسێکە کە لەگەڵیدا لەبەری بکات.

یاخود قَالَ (ابْنُ صَلاَح) رَحِمَهُ اللهُ: « وَلَعَلَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذِنَ فِي الْكِتَابَةِ عَنْهُ لِمَنْ خَشِيَ عَلَيْهِ النِّسْيَانَ، وَنَهَى عَنِ الْكِتَابَةِ عَنْهُ مَنْ وَثِقَ بِحِفْظِهِ، مَخَافَةَ الِاتِّكَالِ عَلَى الْكِتَابِ»[1].

واتە: ڕەنگە ڕێگەپێدان بە نووسین بۆ کەسێك بێت کە ترسی لەبیرچوونەوەی هەبێت و ڕێگرییەکەش بۆ کەسێك بێت کە دڵنیا بێت لە لەبیرنەچوونەوەی، وە لەبەر ئەوەیش کە پشت نەبەستێت بە نووسینەوەی و لەبەرکردن پشتگوێ بخات.

وەکوو (إِبْرَاهِيم الْنَّخَعِي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «لَا تَكْتُبُوا فَتَتَّكِلُوا»[2].

واتە: مەنووسنەوە تا پاڵ نەدەنەوە.

وە (خَالِدٌ الْحَذَّاءُ) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «مَا كَتَبْتُ حَدِيثًا قَطُّ، إِلَّا حَدِيثًا طَوِيلًا، فَإِذَا حَفِظْتُهُ مَحَوْتُهُ»[3].

واتە: هیچ شتێکم نەنووسیوەتەوە بێجگە لە فەرموودەی درێژ نەبێت، بەڵام کاتێکیش کە لەبەرم کردووە سڕیومەتەوە.

**لەو زانایانەش کە خاوەنی ئەم ڕایەن:**

- ابن حبان رَحِمَهُ اللهُ في كتاب "الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان" (١/ ٢٦٥).
- البيهقي رَحِمَهُ اللهُ في "المدخل إلى السنن الكبرى" ص٤١٠.
- ابن عبد البر رَحِمَهُ اللهُ في "جامع بيان العلم وفضله" (١/ ٢٩٢).
- الخطيب البغدادي رَحِمَهُ اللهُ في "تقييد العلم" ص٨٥.

---

(١) "مقدمة ابن صلاح" ص١٨٢، و "التقييد والإيضاح" للعراقي ص٢٠٣، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٣٠.

(٢) رواه ابن عبد البر في "الجامع" (٣٧٣)، وفي "المطالب العالية" لابن حجر (٣٠٣٢).

(٣) رواه ابن الجعد في "مسنده" (١٢٦٥)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٧/ ١٩٢)، وسبق تخريجه ص٢٤.

هەموو ئەم بۆچوونانە یەك مەبەست و مانا دەگەیەنێت، ئەویش بۆ پاراستنی قورئانە لەو سەرەتای دابەزینەیدا، کە زۆر پێویستی بە ئاشنایی و کۆکردنەوە و گرنگیپێدانێکی تایبەتی هەبووە، بە لەبەرکردن و تێگەیشتن و بڵاوبوونەوە و ناسینی بە یاسا و بنەمای شەرعی سەرەکی و سەرچاوەی تایبەت بۆ موسوڵمانان، وە یەکێکە لە پێویستییە تایبەتییەکانی ناو نوێژ و وتار و خوێندنەوەکان.

ئەم گرنگیپێدانەش ئەوە دەخوازێت کە جەخت لە گشت خەڵکی بکرێتەوە بۆ پاراستنی ئەو مەبەستانە و ڕاهاتنی خەڵك لەسەری، تاوەکوو ئەو کاتەش قورئان خاوەنی ناسینێکی تایبەت و ئاشناییەك دەبێت، بە باس و دارشتنەکانی جیا دەکرێتەوە لە هەموو گوفتارێکی تر، ئەوکات هەر فەرموودە و باسێك هەبێت جیاکارییەکی تەواو بەخۆیەوە دەبینێت و بە ڕیزبەندی دووەم لەدوای قورئانەوە هەژمار دەکرێت.

بۆیە هەموو حوکمێکیش لەگەڵ هۆکاردایە، (الأَحْكَامُ تَدُوْرُ مَعَ الْعِلَلِ وُجوْدًا وَعَدَمًا)[1] بە بوونی هۆکارەکە حوکمەکە هەیە، بە نەبوونی نەمانی حوکمەکەیە، بۆیە ئەو کارانە بووەتە هۆکار بۆ ڕێگرتن لە نووسینەوەی فەرموودە، کاتێك هۆکارەکان نەمان؛ ڕێگرتنیش لە نووسینەوە نامێنێت.

لە هەمووشی دیارتر بۆ ڕێگرتن؛ کەمی و سەرەتایی هۆکارەکانی نووسینەوەیە لەو سەردەمەدا، کە پێویست دەکات و لەپێشترە هەرچی توانا و هۆکار هەیە بەکاربهێنرێت بۆ خزمەتی قورئان و بڵاوبوونەوەی و پاراستنی.

ئەم جۆرە مەبەستانە بۆ بێجگە لە قورئان ڕەچاوکراوە چ جای قورئان، وەکوو چەندساڵێك بانگەوازی لە مەککەدا بە نهێنی، بۆ خۆگرتن و ناسینی زیاتر و پاڵپشت دروستکردن بۆ ئەم دینە ... وە کۆچکردن بۆ مەدینە بۆ ڕەخساندنی بواری زیاتر بۆ بانگەوازی و بڵاوبوونەوە ...، وە مامەڵەی نەرم و نیان لەگەڵ دووڕووواندا بۆ هۆکاری زیاتر خۆگرتن و هیدایەتیان ... چەندەها هۆکاری تر بۆ خزمەتی زیاتر و خوێندنەوەی لەپێشترەکان و گرنگییە بنەڕەتییەکان پێش ئەوانی تر.

---

(١) "أصول السرخسي" (٢/١٧٨)، و "الفروق" للقرافي (٢/٦٢)، و "القول المفيد في أدلة الاجتهاد والتقليد" للشوكاني ص٧٢.

وە دەشبێت: «أَنَّهُ نِهِيَ عَنِ التَّدْوينِ الرَّسْمِي كَمَا كَانَ يُدَوَّنُ الْقُرْآنَ»[١].

واتە: ڕێگرییەکە مەبەست پێی نووسینەوەی فەرمی بێت، وەکوو چۆن قورئان بە فەرمی نووسراوەتەوە.

**دووەم:** یەکێکی تر لە ڕێگە زانستییەکانی تر (نسخ)ە، واتە سڕینەوە، بۆ چارەسەرکردنی دوو بەڵگەی جیاواز لە بابەتێکدا، زانایانیش لەم بابەتەدا هەندێکیان بڕیاری سڕینەوەی فەرمانەکانی ڕێگریکردن لە نووسیندا دەکەن بە فەرمان و ڕێگەپێدانەکانی نووسین.

بۆ بابەتی (نسخ)یش پێویستمان بە مێژووی پێش و پاشی هەردوو جۆر بەڵگەکە هەیە، تاوەکوو بەڵگەی سەرەتا دیاری بکرێت و بسڕدرێتەوە و بەڵگەی پاش ئەو کاری پێ بکرێت.

قَالَ (ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «قَدْ صَحَّ عَنْ النَّبِيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّهْي عَنْ الْكِتَابَة وَالْإِذْن فِيهَا ، وَالْإِذْن مُتَأَخِّر ، فَيَكُون نَاسِخًا لِحَدِيثِ النَّهْي ، فَإِنَّ النَّبِيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي غَزَاة الْفَتْح " أُكْتُبُوا لِأَبِي شَاة " يَعْنِي خُطْبَته الَّتِي سَأَلَ أَبُو شَاة كِتَابَتهَا ، وَأَذِنَ لِعَبْدِ اللهِ بْن عَمْرو فِي الْكِتَابَة»[٢].

واتە: ڕیوایەتی (صحیح) لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە لەسەر ڕێگری لە نووسینەوەی فەرموودە و ڕێگەپێدانی، ڕێگەپێدانەکە لە کۆتاییدا بووە، بەمە دەبێتە سڕەرەوەی فەرموودەی ڕێگرییەکان، لەبەرئەوەی:

- پێغەمبەر ﷺ لە گرتنەوەی مەککەدا فەرمووی (بنووسنەوە بۆ ئەبو شاە)، واتە وتاری فەتحی مەککە، کاتێك ئەو پیاوە یەمەنییە داوای نووسینەوەی کرد.
- وە ڕێگەی بە (عبدالله ی کوڕی عەمر) دا بە نووسینەوە، ئەم فەرموودەیەش دوای ڕێگرییەکەی دێت، لەبەرئەوەی بەردەوام دەینووسییەوە، وە کاتێکیش وەفاتی کرد نووسراوەکەی لای بووە، کە پێی دەوترا پەڕاوگەی ڕاستگۆ (الصحيفة الصادقة)، ئەگەر ڕێگرییەکە لە کۆتاییدا بوایە دەبوایە (عبدالله) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا بیسڕیایەتەوە، لەبەر فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ بە سڕینەوەی

(١) "السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي" للسباعي ص٦١.

(٢) "تهذيب سنن أبي داود وأيضاح مشكلاته" لابن القيم (٢/ ٢١٩).

بێجگە لە قورئان، بەڵام کاتێك نەیسڕیوەتەوە و هێشتوویەتییەوە؛ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕێگەپێدان بە نووسینەوە لەپاش ڕێگرییەکەی هاتووە.

• وە لە پێغەمبەریشەوە ﷺ لە ڕیوایەتێکی (صحیح)دا هاتووە لەکاتی نەخۆشییەکەی پێش وەفاتی، فەرمووی: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا»(١).

واتە: پەڕاوێکم بۆ بێنن نووسینێکتان بۆ بنووسم کە لەپاش ئەوەوە گومڕا نەبن بەهیچ شێوەیەك.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا فەرمانکردن بە نووسینەوە لە کۆتاییدا بووە، لەبەرئەوەی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ بێجگە لە قورئان ویستی نووسینەوەی هەر هەبووە.

کەواتە هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە نووسینەوە بێجگە لە قورئان؛ بۆ ئەوە بووە کە هیچ شتێك تێکەڵ بە قورئان نەکرێت، وە کاتێك قورئان ناسرا و جیا کرایەوە، بەتایبەت لەبەرکردن و پاراستنی بۆ کرا، متمانەی لەسەر ئەوە بۆ دروست بوو کە هیچ شتێکی تێکەڵ نابێت؛ ئەوکاتە ڕێگە درا بە نووسینەوەی.

**لەو زانایانەش کە وەکوو (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ خاوەنی ڕای (نسخ) کردنەوەن ئەمانەن:**

- ابن قتيبة رَحِمَهُ اللَّهُ في "تأويل مختلف الحديث" ص٢٨٦.
- ابن شاهين رَحِمَهُ اللَّهُ في "الناسخ والمنسوخ" ص٤٧٢.
- الخطابي رَحِمَهُ اللَّهُ في "معالم السنن" (٤/ ٦١).
- المنذري رَحِمَهُ اللَّهُ في "مختصر سنن أبي داود" (٥/ ٢٤٧).
- النووي رَحِمَهُ اللَّهُ في "شرح مسلم" (١٨/ ١٣٠).
- ابن تيمية رَحِمَهُ اللَّهُ في "مجموع الفتاوى" (٢٠/ ٣٢٢).
- ابن حجر رَحِمَهُ اللَّهُ في "فتح الباري" (١/ ٣٠٨).
- ابن صلاح رَحِمَهُ اللَّهُ في "المحدث الفاضل" ص٣٨٦.
- ابن الأثير رَحِمَهُ اللَّهُ في "النهاية في غريب الحديث" (٤/ ١٤٨).

---

(١) رواه البخاري (٣٠٥٣)، ومسلم (١٦٣٧)، وسبق تخريجه ص٣٩.

📖 البغوي رَحِمَهُ ٱللَّهُ في "شرح السنة" (١/ ٢٩٤).

**وە لە زانایانی ئەم کۆتاییەشدا:**

📖 أحمد شاكر رَحِمَهُ ٱللَّهُ في "الباعث الحثيث" (٢/ ٣٨٠).

📖 الشَّيخ الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ في "تعليقه على الباعث الحثيث".

📖 محمد أبو شهبة في "دفاع عن السنة" ص٢٠.

**سێیەم:** لە کۆتا ڕوانگەی چارەسەری بەڵگە پێچەوانەکان (تعارض الأدلة) بریتییە لە: (الترجيح)، واتە بەهێزکردنی لایەك بەسەر لاکەی تردا بە ڕێگە زانستییەکان.

بە کۆی گشتی ئەو فەرموودانەی کە ڕێگری دەکرد لە نووسینەوەی فەرموودەدا؛ پلەکانیان (ضعيف)ە، وە هەندێکیشیان بۆ ئەو مەبەستە نییە، وە لە ئەنجامی بەدواداچوونی ڕیوایەتەکاندا دەبینین لەسەر ئەم سێ هاوەڵە ڕێگرییەکان ڕیوایەت کراوە: (أبو سعيد الخدري، أبو هريرة، زيد بن ثابت) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ، کە بەهێزترینیان ڕیوایەتەکەی (أبو سعيد الخدري)یە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ لە "صحيح مسلم" دا:

«لَا تَكْتُبُوا عَنِّي، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ».

ئەم ڕیوایەتە ئیمامی (بوخاری) و (موسلیم) ڕای جیاوازیان هەیە لەسەری کە ئایا (مرفوع)ە یان (موقوف)ە، ئایا فەرموودەیە یاخود قسەی (أبو سعيد) خۆیەتی!

قَالَ (ابن حجر) رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «وَمِنْهُمْ مَنْ أَعَلَّ حَدِيثَ أَبِي سَعِيدٍ وَقَالَ الصَّوَابُ وَقْفُهُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ قَالَهُ الْبُخَارِيُّ وَغَيْرُهُ»[1].

واتە: زانایان ڕەخنە لەسەر ئەم ڕیوایەتە دروست دەکەن، دەڵێن: ڕاستترین قسە ئەوەیە کە (موقوف)ە و قسەی (أبو سعيد)ە، ئەمە ڕای (بوخاری) و هەندێك لە زانایانە.

وَقَالَ (الخطيب) رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «تَفَرَّدَ هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى بِرِوَايَةِ هَذَا الْحَدِيثِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ هَكَذَا مَرْفُوعًا. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ أَيْضًا، عَنْ زَيْدٍ. وَيُقَالُ أَنَّ الْمَحْفُوظَ رِوَايَةُ هَذَا الْحَدِيثِ

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٢٠٨).

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ مِنْ قَوْلِهِ، غَيْرَ مَرْفُوعٍ إِلَى النَّبِيِّ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[١].

**واته: لە یەك ڕێگەوە ئەم فەرموودەیە بەرز کراوەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ڕێگەکەی (همام)ە، بەڵام لە ڕێگەکانی ترەوە بە قسەی (أبو سعيد الخدري) رضي الله عنه هاتووە.**

**ئەم تەنیاییە (تَفَرُّد) لەم ڕیوایەتەدا کە ڕاوی (همام)ی تێدایە هۆکارە بۆ ئەوەی هێزی بەڵگەیەتی نەمێنێت، وە تەنانەت (بوخاری) بە قسەی (أبو سعيد الخدري) رضي الله عنه دەداتە قەڵەم[٢]، وە ڕیوایەتەکەی تری (أبو سعيد الخدري) کە دەڵێت: «اسْتَأْذَنَّا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الكِتَابَةِ فَلَمْ يَأْذَنْ لَنَا»، وە ڕیوایەتەکەی (أبو هريرة) رضي الله عنه کە دەڵێت: «كُنَّا قُعُودًا نَكْتُبُ مَا نَسْمَعُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: "مَا هَذَا تَكْتُبُونَ؟"»، هەردووکیان یەکێك لە ڕاوییەکانی** (عبد الرحمن بن زيد بن أسلم)**ە، کە** الشَّيْخ (شعيب بن الأرنؤوط) **دەڵێت**: وعبد الرحمن بن زيد، فقد أجمع أهل العلم بالنقل على تضعيف أخباره، وليس هو بحجة فيما ينفرد به، **وە بە ڕیوایەتەکەی** (أبو هريرة) رضي الله عنه **دەڵێت**: حديث صحيح، وهذا إسناد ضعيف، لضعف عبد الرحمن بن زيد[٣].

**واته: ڕای زانایان لەسەر لاوازییەتی.**

**وە ڕیوایەتەکەی** (زيد بن ثابت) رضي الله عنه قال (الأرنؤوط) في "تخريج سنن أبي داود" تحت رقم (٣٦٤٧): إسناده ضعيف لانقطاعه، وقال (الألباني) في "تخريجه لسنن أبي داود" تحت رقم (٣٦٤٧): ضعيف الاسناد، وقال (ابن الوزير) في "الأنوار الكاشفة" ص٤٣: فالمروى عن زيد بن ثابت متفق على ضعفه.

**واته: شێخ (الأرنؤوط، الألباني، ابن الوزير) لاوازیان کردووە.**

---

(١) "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٣١.

(٢) قال ابن الوزير المعلمي في "الأنوار الكاشفة" ص٤٣: والصواب عن أبي سعيد من قوله.

(٣) "مسند أحمد" (١٥٦/١٧) تحت حديث رقم (١١٠٩٢)، وانظر: "ميزان الاعتدال" للذهبي (٢/ ٥٦٤)، و "الجرح والتعديل" لابن أبي حاتم (٥/ ٢٣٣).

بەم شێوەیە ڕیوایەتەکەی (زەید)یش نەبووە بەڵگە، کەواتە سەرجەم ڕیوایەتەکانی ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرمووده وەکوو (ابن الوزیر) ﵀ دەڵێت: «أقول: أما الأحاديث فإنما هي حديث مختلف في صحته، وآخر متفق على ضعفه»[1].

واتە: فەرموودەکانی ڕێگریکردن فەرموودەیەکن کە ڕای جیاواز هەیە لەسەر (صحيح)بیان و هەندێکیشیان کۆدەنگی هەیە لەسەر (ضعيف)بیان.

بە ڕێگەی (الترجيح)یش ڕوون بووەوە، ئەو لایەی کە فەرمان دراوە بە نووسینەوە بەهێزترە بەسەر ئەو لایەدا کە ڕێگری لێ دەکات لە ڕووی (تخريج)ی سەنەدەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گونجاوترە لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکان، لە گەیاندنی دین و هەوڵ و کۆشش بۆ پاراستنی و بڵاوبوونەوە و فێربوونی ئیسلام و (إقامة حجة) بەسەر خەڵکەوە و ئەو هەموو هاندانە لەسەر گەیاندنی دین.

بۆ زیاتر ئاشنابوون باشترین نووسراویش لەم بوارەدا نووسینەکەی ئیمام (خطيب البغدادي)یە ﵀، بەناوی "تقييد العلم" کە لە ساڵی (٤٦٣ ك) وەفاتی کردووە، کاتی خۆی لە بەرپەرچدانەوەی فیرەقە گومڕاکاندا نووسیویەتی، کاتێك ئەوان هەمان گومانیان دروست دەکرد لەسەر فەرموودە، وە گرنگترین بەرهەم و ئامانجی نووسینەکەی ئەم خاڵانەن[2]:

١. هیچ فەرموودەیەك لە ڕێگریکردنی نووسینەوەی فەرموودەدا (صحيح) نییە، بێجگە لە فەرموودەکەی (أبو سعيد الخدري) ﵁ نەبێت، کە ئەویش ڕای جیاوازی (بوخاری و موسلیم)ی لەسەرە، ئایا فەرموودەیە یاخود قسەی (أبو سعيد الخدري) خۆیەتی.

٢. کاری نووسینەوە جێگیر بووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە چەند بەڵگەیەك، لەوانە ڕێگەدانی (عبدالله بن عمرو) ﵁.

٣. نووسینەوەی فەرموودە بوونی هەبووە بە شێوە گشتییە سەرەتاییەکەی، واتە پارچەپارچە و بابەتی جیاجیا و بە ڕێژەی کەم تا زۆر، نەك (تصنيف)، بەڵکوو نووسینی تایبەت و سەربەخۆ بووە.

---

(١) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير المعلمي ص٣٤.

(٢) تێڕوانین لە کتێبی "تدوين السنة النبوية نشأته وتطوره من القرن الأول إلى نهاية القرن التاسع الهجري" لمحمد آل مطر الزهراني ص٧٣.

**٤**. ڕێگریکردنی هاوەڵان لە نووسینەوەی فەرمووده لەبەر ڕێگریکردنی پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بۆیە هەریەکەی بە هۆکارێك ڕێگرییەکەی باس دەکات، هەمووشی کۆ دەبێتەوە لە خەمخۆری و هەستکردن بە لێپرسراوێتی ئەم دینە، هەر لە (ئەبو بەکری صدیق) ﷛ کە وتی: «لَوْ كَانَ قَالَهُ رَسُوْلُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا خَفِيَ عَلَى أَبِيْ بَكْرٍ»[(١)].

واتە: ئەگەر فەرمووده بوایە ئەوا لە (ئەبو بەکر) شاراوە نەدەبوو.

وە (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷛ کە وتی: «وَإِنِّي وَاللهِ لَا أَلْبَسُ كِتَابَ اللهِ بِشَيْءٍ أَبَدًا»[(٢)].

واتە: هاوشێوەی کیتابی خوا تێکەڵ ناکەم.

کە بگرە وەکوو (ابن الوزير) ﷀ دەڵێت: «فلو كان النبي صلى الله عليه وسلم نهى عن كتابة الأحاديث مطلقاً لما كتب أبو بكر، ... لماهم بها عمر وأشاربها عليه الصحابة»[(٣)].

واتە: گەر پێغەمبەر ﷺ ڕێگری تەواوی بکردایە لە نووسینەوەی فەرمووده؛ (ئەبوبەکر و عومەر) ﵄ ویستی کۆکردنەوەیان نەدەبوو، وە تەنانەت پرسکردنیان بە هاوەڵانیش.

وە هەندێکیشیان تەنانەت دەیاننووسییەوە و پاشان دەیانسڕییەوە، وە هەریەکەیان بە هۆکارێك ڕێگری دەکرد، ئەویش پاراستنی قورئان و مانەوەی لەبەرکردن بوو لەناو هاوەڵاندا و ... .



(١) "كنز العمال" للشاذلي (١٠/ ٢٨٥) برقم (٢٩٤٦٠)، وسبق تخريجه ص٣٧.

(٢) رواه عبدالرزاق في "جامع معمر بن راشد" (٧٣١)، والبيهقي في "المدخل" (٧٣١)، وسبق تخريجه ص٤٤.

(٣) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير المعلمي ص٢٤.

# بەڵگەکان لەسەر نووسینەوەی فەرمووده و گرتنەبەری هۆکارەکانی

وەکوو لەمەوپێش سەلماندمان کە نووسینەوە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی پاراستنی زانست، بەڵام مانای ئەوە نییە کە گەر زانست نووسرایەوە ئەوا بە نووسینەوەکەی دەبێتە بەڵگە، وە بەڵگەکاری لەسەر نووسینەوە وەستابێت، ئەوەتا قورئان بە پارچەپارچە و بێ نووسین هاتووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پێویستی بەوە نەبووە بە نووسینەوە دابەزێت تا زیاتر ببێتە بەڵگە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بووە، بەڵام بنەما لێرەدا متمانە و دادپەروەری هەڵگری زانستەکەیە گەر بە هەر هۆکارێك بگەیەنرێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ (معصوم) بووە و قورئانیش بووەتە بەڵگە.

دەبینین ئەو هەموو کتێبە نووسراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا متمانە لەسەر نووسینەوەکە نییە، بەڵکوو لەسەر نووسەرەکەیە، گەر نووسەرەکە شوێنی متمانە و کاملی و زانای دین بێت و بابەتەکانی بە بەڵگەوە پێکابێت؛ ئەوا بەڵگەکار و ڕۆشنکاری ئەو بابەتەیە.

وە گەر قورئان بەڵگە بێت و ڕۆشنکەرەوەکەی کە فەرموودەیە نەبێتە بەڵگە بەبێ هۆکاری نووسینەوە؛ ئەوا دەبوایە پێغەمبەر ﷺ ئەم کارەی پشتگوێ نەخستایە و بینووسیایەتەوە وەکوو قورئان، لەبەرئەوەی ئەوە ئەرکی سەر شانی ئەوە بۆ گەیاندنی دین، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرمویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ [المائدة : ٦٧].

لە هەمووی زیاتر فەرمانە کردارییەکانی وەکوو نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات ... کە بۆخۆی پێویستی بە ڕوونکردنەوە و نووسینەوەی تەواو بووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەداوە بە نووسینەوەی ئەو کارانە و پاراستنی و بڵاوبوونەوەی وەکوو قورئان، بەڵکوو بەجێی هێشتووە بۆ گەیاندنی بە ڕێی هاوەڵاندا و دڵنیایی تەواوی لە پاراستنی خوایی و گەیاندنی ئەو دینە، پاشان متمانە و دادپەروەری و ڕاست و دروستی هاوەڵان، کە هۆکاری تەواو سەرەکییە بۆ گەیاندنی لەسەر شانی ئەوان.

ئەگەرچی نووسینیش گرنگی تایبەتی و تەواوکاری خۆی هەیە لەدوای متمانەی هەڵگرەکەیەوە و دەبێتە پاراستنی تایبەتی بۆی، هەر بۆیە خوای پەروەردگاریش فەرمانی بە نووسینەوەی قەرز و بەندە ئازادکردن و ... داوە، وەك ئیمامی (الطحاوي) رحمه الله دەڵێت: «فَلَمَّا أَمَرَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ بِكِتَابَةِ الدَّيْنِ خَوْفَ الرَّيْبِ، كَانَ الْعِلْمُ الَّذِي حِفْظُهُ أَصْعَبُ مِنْ حِفْظِ الدَّيْنِ أَحْرَى أَنْ تُبَاحَ كِتَابَتُهُ، خَوْفَ الرَّيْبِ فِيهِ، وَالشَّكِّ»[1].

واتە: کاتێك خوا جل جلاله فەرمانی بە نووسینەوەی قەرز داوە لە ترسی گومان؛ ئەوا زانست کە پاراستنی قورسترە لە پاراستنی قەرز، لەپێشترە رێگە بە نووسینەوەی بدرێت، بۆ پاراستنی لە گومان.

وە (ابن صلاح) رحمه الله دەڵێت: «ثُمَّ إِنَّهُ زَالَ ذَلِكَ الْخِلَافُ وَأَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى تَسْوِيغِ ذَلِكَ وَإِبَاحَتِهِ، وَلَوْلَا تَدْوِينُهُ فِي الْكُتُبِ لَدُرِسَ فِي الْأَعْصُرِ الْآخِرَةِ، وَاللهُ أَعْلَمُ»[2].

واتە: پاش نەمانی ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان هاوەڵاندا بووە لەسەر نووسینەوەی فەرمووده، موسوڵمانان کۆدەنگ بوون لەسەر رێگەپێدانی و بە حەڵاڵزانینی، وە گەر نووسینەوەی نەبووایە لەو سەردەمانەی دواییدا؛ دەبووە هۆکاری لەناوچوونیان.

وە ئیمامی (البغوي) رحمه الله دەڵێت: «فَأَمَّا أَنْ يَكُونَ نَفْسُ الْكِتَابِ مَحْظُورًا، فَلَا، يَدُلُّ عَلَيْهِ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: "بَلِّغُوا عَنِّي". وَفِي الأَمْرِ بِالتَّبْلِيغِ إِبَاحَةُ الْكِتْبَةِ، وَالتَّقْيِيدُ، لأَنَّ النِّسْيَانَ مِنْ طَبْعِ أَكْثَرِ الْبَشَرِ، وَمَنِ اعْتَمَدَ عَلَى حِفْظِهِ لَا يُؤْمَنُ عَلَيْهِ الْغَلَطُ، فَتَرْكُ التَّقْيِيدِ يُؤَدِّي إِلَى سُقُوطِ أَكْثَرِ الْحَدِيثِ، وَتَعَذُّرِ التَّبْلِيغِ، وَحِرْمَانِ آخِرِ الأُمَّةِ عَنْ مُعْظَمِ الْعِلْمِ»[3].

واتە: خۆی بۆ خۆی خودی نووسینەوە قەدەغەکراو بێت ئەوە ناگەیەنێت، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (لە منەوە بیگەیەنن)، وە فەرمانکردن بە گەیاندن دروستبوونی نووسینەوە بووە و پەیوەستبوون بووە پێوەی، لەبەرئەوەی لەبیرچوونەوە لە سروشتی زۆری ئادەمیزادە، وە ئەوەی

---

(١) "شرح معاني الآثار" للطحاوي (٤/ ٣١٩).

(٢) "مقدمة ابن صلاح" ص٢٩٤.

(٣) "شرح السنة" للبغوي (١/ ٢٩٥).

پشت ببەستێت بە لەبەرکردن متمانە نییە کە هەڵەی تێدا نەکات، ئەوەش دەبێتە هۆکاری نەمانی زۆری فەرموودە و قورسایی و نەگەیاندنی و بێبەشبوونی کۆتایی ئەم ئوممەتە لە زۆری زانست.

الشَّيْخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «والأصل في كتابة الحديث الحل، لأنها وسيلة، وقد أذن النبي صلّى الله عليه وسلّم لعبد الله بن عمرو أن يكتب ما سمعه منه، فإن خيف منها محذور شرعي منعت، وعلى هذا يحمل النهي في قوله صلّى الله عليه وسلّم: "لا تكتبوا عني شيئاً غير القرآن" ...، وإذا توقف عليها حفظ السنة وإبلاغ الشريعة كانت واجبة»(١).

واتە: بنەما لە نووسینەوەی فەرموودەدا درووستبوونە، لەبەرئەوەی هۆکارە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە (عبدالله بن عمرو) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کە فەرموودە لەوەوە بنووسێت، وە گەر ترسێکی شەرعی تیادا بێت؛ ئەوا ڕێگری لێ دەکرێت، هەر لەسەر ئەمەیە لە فەرموودەکەدا دەفەرموێت (لە منەوە هیچ مەنووسن بێجگە لە قورئان) ...، بەڵام ئەگەر پاراستنی سوننەت و گەیاندنی دین لەسەری وەستا؛ ئەوا واجبە نووسینەوەی.

کەواتە وا دیارە بە گوێرەی ڕیوایەتەکان ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرموودە بنەمایەکی ئەوتۆی نەبووبێت، یاخود لە نەنووسینەوەیدا مەبەست تەنها ئەوە بووە کە لەگەڵ قورئاندا نەبێت لە یەك شوێندا.

بۆیە تەنانەت ڕایەك هەیە لەسەر پێچەوانەی، کە ڕێگریکردن لە نووسینەوەی لە کۆتاییدا بووە.

وە (محمد رشيد رضا) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: بەڵام ئەمە زۆر نەگونجاوە لەگەڵ بوونی ئەو پەڕاوگە نووسراوە فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دەستی هاوەڵاندا، وەکوو لەمەودوا دێت(٢).



(١) "مصطلح الحديث" للعثيمين ص٤٢.

(٢) "مجلة المنار" لمحمد رشيد رضا ومجموعة من المؤلفين (١٠/ ٧٦٧).

# جـۆری نـووسـینەوەکـان

**نووسینەوە لـە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لـەناو عەرەبدا لـەمانەدا بوونی بووە:**

**١. نووسینەوەی تەورات و ئینجیل، وەك خوێندنەوەی تەورات لـەلایەن ئیمامی (عومەری کوڕی خەتتاب)ەوە رضي الله عنه[١].**

**٢. نووسینەوەی پەیماننامەکان، وەکوو پەیماننامەی ئابلۆوقە (حصار)ی سەر پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان لـە مەککە و (حلف الفضول) ... .**

**٣. نووسینەوەی قەرز و بازرگانی، بەتایبەت ناو قورەیش.**

**٤. نامەی تایبەتی کەسایەتی، وەکوو نامەکەی (ملك غَسَّان) بۆ (کعب بن مالك) رضي الله عنه[٢]، وە نامەکەی (حاطب) بۆ خەڵکی مەککە ... .**

**٥. نووسینەوەی شیعر و قەسیدەکان، بەتایبەت (معلقات السبعة) کە بە دیواری کەعبەدا هەڵواسراوە، وە لـە بازاڕی (عکاظ)یش[٣].**

**٦. وەسیەت و پەندەکان.**

**وە نووسینەوەی نامە تایبەتییەکانی پێغەمبەر ﷺ، وەك[٤]:**

**٧. نامەکانی بۆ پاشا و سەرکردەکانی دونیا، وەکوو (کسرى، قیصر، مصر، بحرین، الشام، الغساني، النجاشي)[٥].**

**٨. پەیماننامەکان، وەکوو: رێککەوتنی حودەیبییە و دەستووری مەدینە و رێککەوتنی نێوان موسوڵمانان و جوولەکەکان.**

**٩. نـامە تایبەتییەکـانی بۆ کاربەدەستەکانی و ئەمیری شارەکان و سرییە نێردراوەکان بۆ جۆری**

---

(١) كما في "المسند" للإمام أحمد (١٥١٥٦)، و "المصنف" لابن أبي شيبة (٢٦٤٢١)، و "السنة" لابن أبي عاصم (٥٠)، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (١٤٩٧)، و "إرواء الغليل" للألباني (١٥٨٩).

(٢) كما في "صحيح مسلم" (٢٧٦٩).

(٣) "مصادر الشعر الجاهلي" (٦١، ٧٣).

(٤) "المعمرون والوصايا" (٢٣، ٢٤).

(٥) "صحيح مسلم" (١٧٧٤)، و "زاد المعاد" لابن القيم (٣/٦٠٨).

جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ...، وەکوو نامەکەی بۆ (سوراقەی کوڕی مالیك) لە کاتی کۆچکردندا و (عمرو بن حزم) بۆ یەمەن ... .

**١٠.** نووسینی ڕووداوەکان و پێکهاتن لەسەر ڕێککەوتنی، وەکوو نووسینی بۆ جوولەکەکانی خەیبەر پاش کوشتنی (عبدالله بن سهل)(١)، وە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە نووسینی ناوی موسوڵمانان(٢)، وە بۆ بڵاوبوونەوەی یاسا شەرعییەکان بۆ خەڵکی (جُرَش)(٣)ی نووسیوە(٤).

ئەمانە نموونەیەکی زیندوون بۆ قەبارەی بوونی نووسین لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، کە بۆخۆی ئەو نامە و نووسینانە بەشێکی زۆری پێکهاتەی یاساکانی شەڕ و مامەڵە لەگەڵ دوژمنان و یاسای بەڕێوەبردنی سەربازی و حوکمە شەرعییەکانە ...، بۆیە تەنانەت هاوەڵان بە بزووتنەوەیەکی خوێندەوار سەیر دەکران لەناو خەڵکی ئەو سەردەمەدا، کە عەرەب ئەو جۆرە بەرەوپێشچوونەی بەخۆیەوە نەدیبوو، ئەمە لە قسەی دووڕووەکاندا دەردەکەوێت، کاتێك قسەیان بە هاوەڵان دەوت، دەیانوت: «مَا رَأَيْنَا مِثْلَ قُرَّائِنَا هَؤُلَاءِ ...»(٥).

واتە: نەمانبینیوە بە وێنەی ئەم خوێندەوارانەمان ... .



(١) كما في "صحيح البخاري" (٧١٩٢).

(٢) كما في "صحيح البخاري" (٣٠٦٠).

(٣) كما في "صحيح مسلم" (١٩٩٠).

(٤) "كتابة الحديث بين النهي والإذن" لأحمد بن محمد حميد ص١٣، ١٧، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٤، ٩، و "جمع القرآن" (دراسة تحليلية لمروياته) لأكرم عبد خليفة حمد الدليمي ص٤٣.

(٥) "تفسير الطبري" (١١/٥٤٣) في تفسير سورة [التَّوْبَة : آيَة : ٦٥].

# پەڕاوگە و نووسینەوەکانی هاوەڵان

## ( صحائف الصحابة )[١]

هاوەڵان لە شارەزایی نووسینەوەدا ژمارەیەکی بەرچاویان هەیە، بۆیە تەرخانکراوەکان بۆ نووسینەوەی قورئان چل[٢] بۆ پەنجا کەس دەبوون[٣]، ئەمە بۆخۆی هێمایەکە بۆ ئەوەی کە دەبێت نووسینەوەی فەرموودەش لە ئاستی تاکەکەسی و لێپرسراویدا بنەمایەکیان بۆ خۆیان هەبێت لەناو هاوەڵاندا، وە دیارە بوونی ئەم ڕێژەی کەسانە بووەتە هۆکاری ڕێگری پێغەمبەر ﷺ لە نووسینەوەی فەرموودە، گەر ڕێگرییەکە لە ئاستێکی کەمیشدا بووبێت، وە هەروەها لە هاوەڵانیشدا.

بۆیە زانایانی فەرموودەناس یەکێك لە بنەماکانی بەهێزکردنی فەرموودە لە ڕووی سەنەدەوە بەستنەوەی فەرموودەکانیان بە پەڕاوگە و قوتابیانی خاوەن پەڕاوگەکانەوە بووە لە هاوەڵاندا، بۆیە ئەو پەڕاوگانە (الصحف) زۆر لای زانایان دیار و ئاشکرایە، کە ئەمە دەبێتە بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە فەرموودەش بە ڕێگەی لەبەرکردن و نووسینەوە پارێزراوە تا گەیشتووەتە دەستی زانایانی کۆکاری فەرموودە، گەرچی بە ڕێگەی یەکەم زیاتر و زۆرتر بوونی هەبووە لەبەر ئەو هۆکارانەی کە لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کرد و چەند هۆکارێکی تر کە لەمەودوا باسی دێت، ئێستا هەندێك لەو پەڕاوگە و نووسینانەی هاوەڵان بۆ فەرموودە دەخەینە ڕوو، کە هەموویان بۆخۆیان لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا بوونیان هەیە، وەك:

### ١. "الصحيفة الصادقة"ی (عبد الله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا.

خۆی ئەو ناوەی لێ ناوە، عَنْ مُجَاهِدٍ قَـالَ: رَأَيْتُ عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو صَحِيفَةً، فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا

---

(١) بۆ وردەکاری ئەم بابەتە بڕوانە کتێبی "دراسات في الحديث النبوي" لدكتور محمد مصطفى الأعظمي ص٧١ - ١٤٣.

(٢) "عيون الأثر" لابن سيد الناس (١/ ٣١٥)، و "تهذيب الكمال" للمزي (١/ ١٩٦)، و "زاد المعاد" لابن القيم (١/ ١١٧)، و "الإستيعاب" لابن عبد البر (٧/ ٦٩)، و "المصباح المضي" لابن حديدة ص٢٥.

(٣) "كتابات النبي" للأعظمي ص٢٠، و "دراسات في الحديث" للأعظمي ص٥٤، و "كتاب الوحي" لأحمد عيسى ص٦٤، و "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٤٩.

فَقَالَ: «هَذِهِ الصَّادِقَةُ»[(١)].

واته: (موجاهید) دەڵێت: پرسیارم لە بارەیەوە کرد، وتی: ئەمە پەڕاوگەی ڕاستگۆیە.

(عبد الله بن عمرو) ﵁ خۆی دەڵێت: «حفظت عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ألف مثل»[(٢)].

واته: لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەزار فەرموودەم لەبەر کردووە.

بەڵام وەکوو (د. محمد عجاج الخطيب) دەڵێت: «فعدد أحاديث ... (٤٣٦) حديثًا بما فيه المكرر ...، وقد يكون حكم ابن الأثير مَبْنِيًّا على أن جميع ما روي عن ابن عمرو هو الصادقة وليس ببعيد»[(٣)].

واته: ژمارەی فەرموودەکانی (الصحيفة)کە چوارسەد و سی و شەش فەرموودەیە بە دووبارەبووەکانەوە، بەڵام دەبێت (ابن الأثير) کە دەڵێت هەزار فەرموودە بووە مەبەستی پێی کۆی گشتی گێڕانەوەکانی (ابن عمرو) بێت و بە پەڕاوگەکەی دابنێت.

ئەم پەڕاوگەیەی کە خۆی زۆر فەخر و دڵخۆشی خۆی پێوە دەردەبڕی؛ دەیوت: «ما يُرغبني فِي الحَيَاةِ إِلاَّ خَصْلَتَانِ: الصَّادِقَةُ وَالوَهْطَةُ، فَأَمَّا الصَّادِقَةُ: فَصَحِيْفَةٌ كَتَبْتُهَا عَنْ رَسُوْلِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ... لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ أَحَدٌ»[(٤)].

---

(١) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٢/ ٢٨٥)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣١/ ٢٦٢)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٣/ ٣٤٥).

(٢) "الاستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٣/ ٩٥٧)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣١/ ٢٦٢)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٣/ ٢٤٥)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (١/ ٢٨٢).

(٣) "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٤٩، ٣٥٠.

(٤) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٢/ ٢٨٥)، و "المحدث الفاصل" للرامهرمزي ص٣٦٦، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٨٤، و "تهذيب الكمال" للمزي (٢٢/ ٧٢)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٤٨٧)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣١/ ٢٦٢)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٣/ ٣٤٥)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٦٥، و "الضوء اللامع المبين عن مناهج المحدثين" لأحمد محرم الشيخ ناجي ص١٥٠، و "كتابة السنة في عهد النبي" لرفعت بن =

واتە: هیچ شتێك لـە دونیادا دڵخۆشی نەكردووم بێجگە لـە پەڕاوگەی (الصادقة) و پارچە زەوییەكی باوكم (الوهط) نەبێت، بەڵام (الصحيفة الصادقة) كە لـە پێغەمبەرەوە ﷺ نووسیومەتەوە هیچ كەسێك لـە نێوانماندا نییە.

ئەو (عبد الله بن عمرو)ەی كە دەڵێت: «كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ حِفْظَهُ، فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ، فَقَالُوا: إِنَّكَ تَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا، فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: "اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا خَرَجَ مِنِّي إِلَّا حَقٌّ"»[(١)].

واتە: من هەموو شتێكم لـە پێغەمبەرەوە ﷺ دەنووسی تا لـەبەری كەم، قورەیش ڕێگرییان لێ كردم، وتیان: ئەو ئادەمیزادە لـە تووڕەبوون و خۆشیدا قسە دەكات، منیش لـە نووسین وەستام و بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: بنووسە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچم لێوە نایەتە دەر بێجگە لـە حەق نەبێت.

وە ئەو (عبدالله)یەی كە (أبو هريرة) ﷺ شایەتی بۆ دەدات كە دەڵێت: «مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ»[(٢)].

واتە: هیچ كەسێك لـە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هێندەی من فەرموودەی لا نییە، جگە لـە (عبد الله ی كوڕی عەمری كوڕی عاص) نەبێت، چونكە ئەو فەرموودەكانی دەنووسییەوە، بەڵام من نەم دەنووسییەوە.

---

= فوزي عبد المطلب ص١٤، و "الحديث والمحدثون" لمحمد أبو زهو ص٢٢٣، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم العبودي ص٣٢، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٤٩.

(١) رواه أبو داود (٣٦٤٦)، وأحمد في "المسند" (٦٥١٠)، والدارمي في "سننه" (٥٠١)، والحاكم في "المستدرك" (٣٥٩)، والطبراني في "الكبير" (١٤٢٦٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٤٢٨)، والبيهقي في "المدخل" (٧٥٥)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٨٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٣٢)، و "صحيح وضعيف سنن أبي داود" (٣٦٤٦).

(٢) رواه البخاري (١١٣)، وسبق تخريجه ص٣٨.

**وە گرنگی تەواوی بە پاراستنی ئەو پەڕاوگەیە داوە، وەکوو لەم دوو ڕیوایەتەدا دەردەکەوێت:**

١. عَنْ أَبِي قَبِيلٍ الْمَعَافِرِيِّ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ فَسُئِلَ أَيُّ الْمَدِينَتَيْنِ تُفْتَحُ أَوَّلًا قُسْطَنْطِينِيَّةُ أَوْ رُومِيَّةُ؟ قَالَ: فَدَعَا بِصُنْدُوقٍ طُهُمٍ - وَالطُّهُمُ الْخَلْقُ - فَأَخْرَجَ مِنْهَا كِتَابًا فَنَظَرَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَكْتُبُ مَا قَالَ: فَسُئِلَ أَيُّ الْمَدِينَتَيْنِ تُفْتَحُ أَوَّلًا الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ أَوِ الرُّومِيَّةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: **"مَدِينَةُ هِرَقْلَ تُفْتَحُ أَوَّلًا"**»[١].

**واتە: ئێمە لای (عبدالله) بووین، پرسیاری لێ کرا چ شارێك لەو دوو شارە (الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ وَالرُّومِيَّةِ) لە پێشدا فەتح دەکرێت؟ دەڵێت: (عبدالله) داوای سندووقێکی کرد ئەڵقەرێژ بوو، کتێبێکی تیا دەرکرد دەیخوێندەوە، وتی: ئێمە ڕۆژێك لە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ بووین، دەماننووسی، پرسیاری لێ کرا کە چ شارێك لەو دوو شارە لە پێشدا فەتح دەکرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکوو شارەکەی (هیرەقل) یەکەمجار دەگیرێت، واتە (الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ).**

٢. عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنِ عَمْرٍو فَتَنَاوَلْتُ صَحِيفَةً مِنْ تَحْتِ مَفْرَشِهِ، فَمَنَعَنِي، قُلْتُ: مَا كُنْتَ تَمْنَعُنِي شَيْئًا، قَالَ: هَذِهِ الصَّادِقَةُ ، هَذِهِ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ، لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ أَحَدٌ، إِذَا سَلَّمْتَ لِي هَذِهِ وَكِتَابَ اللهِ، تَبَارَكَ وَتَعَالَى، وَالْوَهْطَ فَمَا أُبَالِي مَا كَانَتْ عَلَيْهِ الدُّنْيَا[٢].

**واتە: (موجاهید) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: چوومە لای (عبدالله) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، دەستم برد بۆ پەڕاوگەیەك کە لەژێر سەرینەکەیدا بوو، ڕێگری لێ کردم، وتم: تۆ ڕێگری هیچ شتێکت لێ نەکردووم، وتی: ئەمە ڕاستگۆ (الصادقة)یە، ئەمەم لە پێغەمبەرەوە ﷺ نووسیوە، هیچ کەسێك لە نێوانماندا نەبووە، ئەگەر**

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٦٦٤٥)، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، والدارمي في "سننه" (٥٠٣)، والحاكم في "المستدرك" (٨٥٥٠)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، ووافقه الذهبي، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٩٤٦٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٤).

(٢) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٤/ ٢٦٢)، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٨٤، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لأحمد بن معبد بن عبد الكريم ص١٤، وقال: حسن لغيره، وفي "كتابة الحديث النبوي" لحسناء بنت بكري نجار ص٢٥.

ئەمە و کتێبی خوا و پارچە زەوییەکەی باکمم بۆ بپارێزرێت؛ گوێ نادەم بەوەی لە دونیادا چی دەبێت.

(ابن الوزیر) ﷺ دەڵێت: «كان يسميها "الصادقة" تميزاً لها عن صحف كانت عنده من كتب أهل الكتاب»[(١)].

واتە: بۆیە ناویان ناوە پەڕاوگەی ڕاستگۆ بۆ جیاکردنەوەی لە پەڕاوگەکانی تری ئەهلی کیتاب کە لای بووە.

لە هەمووی زیاتر مایەی متمانە و شانازییە کە بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ فەرموودەی نووسیوەتەوە، وەکوو لە ڕیوایەتەکەی کە باس کرا پێی فەرمووە بنووسە «اكْتُبْ فَوَالَّذِي ...»، وە یەکەم کەسیش بووە لە هاوەڵان ئەو خەمخۆری و بیری لێپرسراوییەی هەبووە ...، وە گەر شوێنی متمانەی تەواوی پێغەمبەر ﷺ نەبوایە؛ ڕێگە و فەرمانی پێ نەدەدا بە نووسینەوەی، وە لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرکاری هەموو قورئان (حافظ) بووە و داوای لە پێغەمبەر ﷺ کردووە کە لە ماوەی سێ ڕۆژدا خەتمی هەموو قورئان بکات لە نوێژەکانیدا: «ثُمَّ رَخَّصَ لَهُ أَنْ يَقْرَأَهُ فِي ثَلَاثٍ»، وَقَالَ النَّبِيُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلِّ مِنْ ثَلَاثٍ؛ لَمْ يَفْقَهْهُ»[(٢)].

وە ئەم (الصحيفة الصادقة)یە بە ڕێگەی نەوەیەکییەوە بە ناوی (عمرو بن شعيب بن محمد بن عبد الله بن عمرو بن العاص)[(٣)] گەیشتووەتە فەرمووده‌ناسان (المحدثون)، وە (ابن المعين) و زانایانی تریش ئەم (صحيفة)یەیان بەناوی (الكتاب)ەوە ناو بردووە[(٤)].

قَالَ (ابْنُ الْقَيِّمْ) ﷺ: «وَصَحَّ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ حَدِيثَهُ، وَكَانَ مِمَّا كَتَبَهُ صَحِيفَةٌ تُسَمَّى الصَّادِقَةَ، وَهِيَ الَّتِي رَوَاهَا حَفِيدُهُ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْهُ، وَهِيَ مِنْ أَصَحِّ الْأَحَادِيثِ»[(٥)].

---

(١) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير المعلمي ص٩٨.

(٢) "صفة صلاة النبي ﷺ" ص١١٩، و "أصل صفة الصلاة" للألباني (٣/ ١٠٦٣).

(٣) "صحيفة عمرو بن شعيب" لمحمد علي بن الصديق (١٠، ١٢٩)، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لأحمد بن معبد بن عبد الكريم ص١٥.

(٤) "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٦٣).

(٥) "زاد المعاد في هدي خير العباد" لابن القيم (٣/ ٤٠٢).

واتە: ڕیوایەتی (صحیح) هەیە لەسەر نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن (عبدالله بن عمرو)ەوە رضي الله عنه، کە پێی دەوترێت (الصحيفة الصادقة)، کە نەوەکەی (عمرو بن شعيب) رحمه الله لە باوکییەوە دەیگێڕێتەوە، لە پلە (صحیح)ترین فەرموودەکانە.

**زانایان دەربارەی (عمرو بن شعيب) رحمه الله دەڵێن:**

قَالَ (الْأَوْزَاعِيّ) رحمه الله: «مَا رَأَيْتُ قُرَشِيًّا أَكْمَلَ مِنْ عَمْرُو بْنَ شُعَيْبٍ»[(١)].

واتە: لەناو قورەیشدا هاوشێوەی (عمرو بن شعيب)م نەبینیوە.

وَقَالَ (الْبُخَارِيُّ) رحمه الله: «رَأَيْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ وَعَلِيَّ بْنَ الْمَدِينِيِّ وَإِسْحَاقَ بْنَ رَاهَوَيْهِ وَأَبَا عُبَيْدٍ وَعَامَّةَ أَصْحَابِنَا يَحْتَجُّونَ بِحَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، مَا تَرَكَهُ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَقَالَ: فَمَنِ النَّاسُ بَعْدَهُمْ؟»[(٢)].

واتە: ئیمامی (بوخاری) رحمه الله دەڵێت: (أحمد بن حنبل وابن المديني وراهويه) و گشت هاوەڵانمان فەرموودەکانی (عمرو بن شعيب) دەکەنە بەڵگە، هیچ کەسێك لە زانایانی موسوڵمانان پشتگوێیان نەخستووە، وە کێی تر هەیە بێجگە لەوان؟ واتە لە زانایانی موسوڵمانان.

وَقَالَ (الْذَّهَبِيُّ) رحمه الله: «أحد علماء زمانه، ووثقه ابن معين، وابن راهويه، وصالح جزرة»[(٣)].

واتە: زانای سەردەمی خۆی بووە، وە متمانەی ئەو زانایانە بووە.

ناوی (عمرو بن شعيب بن محمد بن عبد الله بن عمرو بن العاص) رحمه الله بەم شێوەیە بووە نەسەبی.

---

(١) "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (٦/ ٢٠٣)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٦/ ٨٤)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٢/ ٢٨)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٢٢/ ٧٢)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٣/ ٢٨٨)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٤٨٧)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٦٣)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٨/ ٥٠).

(٢) "فتح المغيث" للسخاوي (٤/ ١٨٨)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (٢/ ٧٣١)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٢٧٣)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٢/ ٢٨)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٢٢/ ٦٩)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٤٨٠)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٢/ ٢٩٠)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٨/ ٤٩).

(٣) "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٦٣).

ڕیوایەتەکانی لای زانایان ئەگەر بەم شێوەیە بێت (عمرو عن أبيه عن جده) لە باوکییەوە و لە باپیرییەوە کە (عبد الله بن عمرو)ە، ئەوا زانایان ڕەخنەیان گرتووە لێی، لەبەرئەوەی گومانیان هەیە کە (شعيب) گەیشتبێت بە (عبد الله)ی باپیری.

بەڵام ئیمامی (الْذَّهَبِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «هذا لا شيء، لأن شعيبًا ثبت سماعه من عبد الله، وهو الذي رباه حتى قيل إن محمدًا مات في حياة أبيه عبد الله، فكفل شعيبًا جده عبد الله، فإذا قال: عن أبيه، ثم قال: عن جده، فإنما يريد بالضمير في جده أنه عائد إلى شعيب»[(١)].

واتە: ئەمە نابێتە ڕەخنە، لەبەرئەوەی (شعيب) گەیشتووە بە (عبدالله) و لێی بیستووە، وە دەڵێت: (محمد) کوڕی (عبدالله) لە سەردەمی ژیانی باوکیدا مردووە و (شعيب) لای خۆی خزمەتی کردووە، بۆیە گەر (عمرو) وتی لە باوکمەوە و لە باپیرمەوە، ئەوە مەبەستی پێی (شعيب)ە کە لە (عبدالله) بیستوویەتی.

وە ئیمامی (العراقي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «قَدْ صَحَّ سَمَاعُ شُعَيْبٍ مِنْ عَبْدِ الله بنِ عَمْرٍو، كَمَا صَرَّحَ بِهِ البُخَارِيُّ فِي "التَّارِيخِ" وَأَحْمَدُ، وَكَمَا رَوَاهُ الدَّارَقُطْنِيُّ وَالبَيْهَقِيُّ فِي السُّنَنِ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ»[(٢)].

واتە: تەواوە و ڕاستە بیستنی (شعيب) لە (عبدالله)وە، وەکوو (بوخاری و أحمد و الدارقطني و بەیهەقی) بە گێڕانەوەیەکی (صحيح) دەیسەلمێنن.

وە (ابن صلاح) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «اِحْتَجَّ أَكْثَرُ أَهْلِ الحَدِيثِ بِحَدِيثِهِ، حَمْلاً لِمُطْلَقِ الجَدِّ فِيهِ عَلَى الصَّحَابِيِّ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو دُونَ ابْنِهِ مُحَمَّدٍ وَالِدِ شُعَيْبٍ، لِمَا ظَهَرَ لَهُمْ مِنْ إِطْلَاقِهِ ذَلِكَ»[(٣)].

---

(١) "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٦٦)، وأيد هذا القول (أحمد شاكر) في تحقيقه لمسند إمام أحمد (٦/ ٨٠) تحت حديث رقم (٦٥١٨).

(٢) "شرح التبصرة والتذكرة = ألفية العراقي" (٢/ ١٨٩)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٤/ ٦٨)، و "الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح" لإبراهيم بن موسى بن أيوب (٢/ ٥٦٥)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٥١.

(٣) "مقدمة ابن صلاح" ص٣١٥، و "المقنع في علوم الحديث" لابن الملقن (٢/ ٥٤٠)، و "فتح المغيث" للسخاوي (٤/ ١٨٨)، و "شرح التبصرة والتذكرة" للعراقي (٢/ ١٨٨)، و "الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح" لإبراهيم بن موسى بن أيوب (٢/ ٥٦٣)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٥١.

واتە: زۆری زانایانی فەرموودە ڕیوایەتەکانیان وەرگرتووە و کردوویانەتە بەڵگە و دەڵێن مەبەست بە باپیری (عبدالله بن عمرو)ە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا نەك (محمد)ی کوڕی، وەکوو بە گشتی وا دیارە.

ئەم ڕەخنەیەشیان لە (عمرو بن شعیب) ئەوەیە کە ئەگەر (شعیب) نەگەیشتبێت بە (عبدالله) ئەوا ڕیوایەتەکە (مرسل یان منقطع)ە، یاخود لە نووسینەکەی (عبدالله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم (الصحیفة الصادقة)ەکەوە وەریگرتووە، ئەوەش بە ڕێگەی بەدەستگەیشتنی نووسین بووە، کە پێی دەوترێت (وجادة)، ئەمەش لای زانایان وەرگیراو نییە.

بۆ ڕەخنەی یەکەم ئەوە ئیمامی (الذهبي والعراقي وابن صلاح ...) وەڵامیان داوەتەوە.

وە بۆ ڕەخنەی دووەم (وجادة)، ئیمامی (الْذَّهَبِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أَمَّا كَوْنُهَا وِجَادَةً، أَوْ بَعْضُهَا سَمَاعٌ وَبَعْضُهَا وِجَادَةٌ، فَهَذَا مَحَلُّ نَظَرٍ. وَلَسْنَا نَقُولُ: إِنَّ حَدِيثَهُ مِنْ أَعْلَى أَقْسَامِ الصَّحِيحِ، بَلْ هُوَ مِنْ قَبِيلِ الْحَسَنِ»[(١)].

واتە: ئەم ڕەخنەیەش بۆخۆی شوێنی تێڕوانینە، وە ئێمە ناڵێین لە بەشی پلە (صحیح)ە بەرزەکانە، بەڵکوو (حسن)ە.

بەڵام ئەم ڕەخنەیەش (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەیڕەوێنێتەوە و دەڵێت: «وَصَحَّ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ حَدِيثَهُ، وَكَانَ مِمَّا كَتَبَهُ صَحِيفَةٌ تُسَمَّى الصَّادِقَةَ، وَهِيَ الَّتِي رَوَاهَا حَفِيدُهُ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْهُ، وَهِيَ مِنْ أَصَحِّ الْأَحَادِيثِ، وَكَانَ بَعْضُ أَئِمَّةِ أَهْلِ الْحَدِيثِ يَجْعَلُهَا فِي دَرَجَةِ أيوب عَنْ نافع عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَالْأَئِمَّةُ الْأَرْبَعَةُ وَغَيْرُهُمُ احْتَجُّوا بِهَا»[(٢)].

وە دەڵێت: «وَقَدْ احْتَجَّ الْأَئِمَّةُ الْأَرْبَعَةُ وَالْفُقَهَاءُ قَاطِبَةً تَصْحِيفَةَ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ، وَلَا يُعْرَفُ فِي أَئِمَّةِ الْفَتْوَى إِلَّا مَنْ احْتَاجَ إِلَيْهَا وَاحْتَجَّ بِهَا، وَإِنَّمَا طَعَنَ فِيهَا مَنْ لَمْ يَتَحَمَّلْ أَعْبَاءَ الْفِقْهِ وَالْفَتْوَى كَأَبِي حَاتِمٍ الْبُسْتِيِّ وَابْنِ حَزْمٍ وَغَيْرِهِمَا»[(٣)].

---

(١) "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٦٨)، و "توضيح الأفكار لمعاني تنقيح الأنظار" للصنعاني (١/ ٢٩١)، و "مغاني الأخيار" لبدر الدين العيني (٢/ ٣٩٦)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٥١.

(٢) "زاد المعاد" لابن القيم (٣/ ٤٠٢).

(٣) "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٧٨).

واتە: (عبداللە) فەرموودەی دەنووسییەوە و ناوی دەبرد بە (الصحيفة الصادقة) و نەوەکەی (عمرو بن شعيب) لە باوکییەوە دەیگێڕایەوە، وە (صحيح)ترین فەرموودە بوون و هەندێك لە ئیمامەکانی فەرموودە بە پلەی (أيوب عن نافع عن ابن عمر) دایان دەنا[١]، وە هەر چوار ئیمامەکانی مەزاهیب دەیکەنە بەڵگە.

وە فەقیهەکان و زانایانی مەزهەبەکان و هەموویان (صحيفة) و ڕیوایەتەکانی (عمرو بن شعيب) دەکەنە بەڵگە، ئیمامێکی فەتوادەرمان نەبینیوە پێویستی پێ نەبێت و نەیکاتە بەڵگە، وە ئەو کەسەیشی کە ڕەخنەی لێ دەگرێت کەسێکە ئەرك و قورسایی (فيقه) و فەتوای هەڵنەگرتووە، وەکوو (أبي حاتم البستي وابن حزم) .... .

مەبەستی پێی ئەوەیە کە ڕێی تێناچێت ئەو (الصحيفة الصادقة)یە لای (عمرو وشعيب ومحمد) دەسکاری بکرێت.

وَقَالَ (الْمُنْذِرِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «الْجُمْهُورُ عَلَى تَوْثِيقِهِ وَعَلَى الِاحْتِجَاجِ بِرِوَايَتِهِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ»[٢].

واتە: کۆی زانایان شوێنی متمانە و بەبەڵگەکردنی ڕیوایەتەکانی ئەون لە باوکی و لە باپیرییەوە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَأَمَّا أَئِمَّةُ الْإِسْلَامِ وَجُمْهُورُ الْعُلَمَاءِ فَيَحْتَجُّونَ بِحَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ إذَا صَحَّ النَّقْلُ إلَيْهِ مِثْلَ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ وَسُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَة وَنَحْوِهِمَا وَمِثْلَ الشَّافِعِيِّ وَأَحْمَد بْنِ حَنْبَلٍ وَإِسْحَاقَ بْنِ رَاهَوَيْه وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: الْجَدُّ هُوَ عَبْدُ اللَّهِ؛ فَإِنَّهُ يَجِيءُ مُسَمًّى وَمُحَمَّدٌ أَدْرَكَهُ قَالُوا: وَإِذَا كَانَتْ نُسْخَةٌ مَكْتُوبَةٌ مِنْ عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ هَذَا أَوْكَدَ لَهَا وَأَدَلَّ عَلَى صِحَّتِهَا؛ وَلِهَذَا كَانَ فِي نُسْخَةِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ مِنْ الْأَحَادِيثِ الْفِقْهِيَّةِ الَّتِي فِيهَا مُقَدَّرَاتُ مَا احْتَاجَ إلَيْهِ عَامَّةُ عُلَمَاءِ الْإِسْلَامِ»[٣].

---

(١) قاله الحاكم في "المستدرك" (١/ ١٩٧): إِذَا كَانَ الرَّاوِي، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ثِقَةً فَهُوَ كَأَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وقاله إسحاق بن راهويه في "التأريخ الكبير" للبخاري (٦/ ٣٤٣)، وفي "السنن الكبرى" للبيهقي (٧/ ٥٢٠)، و "سنن الترمذي" (٣٢٢)، و "الموطأ" لمالك (٦/ ٨٧).

(٢) "الترغيب والترهيب" للمنذري (٣/ ٢٨٩)، و "عون المعبود" للعظيم آبادي (١/ ١٥٦).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ٩).

واتە: ئیمامەکان و کۆی زانایانی ئیسلام ڕیوایەتەکانی (عمرو بن شعیب) دەکەنە بەڵگە گەر (صحیح) بێت، وەکوو (مالك وسفیان والشافعي وأحمد واسحاق ...) و بێجگە لەوانیش، وە ئەو ڕیوایەتانە فەرموودەیەکی زۆری فیقهی لە پێوانەکانی تێدایە کە پێویستی زانایانی ئیسلامە.

وَقَالَ (أَبُو زُرْعَةَ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَهُوَ ثِقَةٌ فِي نَفْسِهِ»[(١)].

واتە: (عمرو بن شعیب) بۆخۆی شوێنی متمانەیە.

وَقَالَ الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللَّهُ: «قلت: والخلاف في عمرو بن شعيب معروف مشهور والمقرر أنه حسن الحديث، يحتج به»[(٢)].

واتە: ڕای جیاوازی زانایان هەیە لەسەری، بەڵام کۆتا بڕیار ئەوەیە پلەی فەرموودەکانی (حسن)ە و دەبێتە بەڵگە.

(عمرو بن شعیب) رَحِمَهُ اللَّهُ لە ساڵی (١١٨)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە[(٣)].

فەرموودەکانی (الصحیفة الصادقة) گەیشتووەتە دەستی زانایانی فەرموودە، وەك لە "مسند الإمام أحمد" بەشی (نۆ و دە و یانزە و دوانزە)، بەناوی (مسند عبد الله بن عمرو)[(٤)]، وە (السنن الأربعة)ش فەرموودەکانی ئەو (الصحیفة)یەی تێدا تۆمار کراوە.

## ٢. "الصحيفة الصحيحة" أو "صحيفة همام بن مُنَبِّه".

ئەم (الصحیفة)یە قوتابی (أبو هريرة)یە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، بەناوی (همام بن منبه بن كامل بن سيج اليماني الصنعاني الأبناوي)، المتوفي: (١٣١هـ)، و ژمارەی فەرموودەکانی (١٣٨) فەرموودەیە[(٥)].

---

(١) "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (٢٢/ ٧١)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٤٨١)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٨/ ٤٩)، و "طبقات المدلسين" لابن حجر ص٣٥، و "مغاني الأخيار" لبدر الدين العيني (٢/ ٣٩٥).

(٢) "إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل" (٤/ ٣٩٢).

(٣) "موطأ" لمالك (٦/ ٨٧).

(٤) "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٥٠.

(٥) "صحيفة همام بن منبه" ص٤، بتحقيق علي حسن، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٥٥.

فەرموودەکانی ئەم (الصحيفة)یە بە (مخطوطة) نووسراوەیی (د. محمد حميد الله) لە (دمشق وبرلين) دۆزیویەتییەوە و (تحقيق)ی کردووە بەناوی (صحيفة همام)[١].

وە هەموو فەرموودەکانی بە تەواوی لە "مسند إمام أحمد" (٢/٣١٢)دا هەیە، لەگەڵ "صحيح البخاري ومسلم" دا هاتووە.

بۆ دڵنیایی لەسەر ئەم (صحيفة)یە (ابن حجر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «فَجَالَسَ أَبَا هُرَيْرَةَ بِالْمَدِيْنَةِ، فَسَمِعَ مِنْهُ أَحَادِيْثَ، وَهِيَ نَحْوٍ مِنْ أَرْبَعِيْنَ وَمِئَةَ حَدِيْثٍ بِإِسْنَادٍ وَاحِدٍ»[٢].

واتە: (همام) لەگەڵ (أبو هريرة)دا دانیشتووە و فەرموودەکانی لێ وەرگرتووە، نزیکەی سەد و چل فەرموودەیە، وە ئیمام (أحمد)یش رَحِمَهُ اللَّهُ هەمان قسەی هەیە لەسەر ژمارەکەی[٣].

(همام بن منبه) رَحِمَهُ اللَّهُ لەدایکبووی ساڵی (٣٢)ی کۆچییە[٤]، وە لە ساڵی (١٣١)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، وە مامۆستاکەی کە (أبو هريره)یە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە ساڵی (٥٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

٣. **"صحيفة جابر بن عبد الله"** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا کە لە ساڵی (٧٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

تابعی بەڕێز (قتادة بن دعامة السدوسي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لأَنَا بِصَحِيفَةِ جَابِرٍ أَحْفَظ مِنِّي مَن سُورَة البَقَرَةِ»[٥].

واتە: پەڕاوگەکەی (جابر)م باشتر لەبەرە تاوەکوو سوورەتی [الفاتحة].

عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: كُنْتُ أَنْطَلِقُ أَنَا وَمُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ أَبُو جَعْفَرٍ،

---

(١) "صحيفة همام بن منبه" ص٢١، ٢٢، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح ص٣٢.

(٢) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (١١/٦٧)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٣٠/ ٣٠٠)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٣/ ٧٤٧)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣١٢)، و "التكميل في الجرح والتعديل" لابن كثير (٢/ ١٢)، و "مغاني الأخيار" لبدر الدين العيني (١/ ٥٠٦).

(٣) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣١٢)، و "منهج الإمام أحمد في إعلال الأحاديث" لبشير علي عمر (٢/ ٧٧٦).

(٤) "المستَخرجُ من كُتب النَّاس للتَّذكرة والمستطرف من أحوال الرِّجال للمعرفة" لابن منده (٢/ ٥٣٩).

(٥) "التأريخ الكبير" للبخاري (٤/ ١٨٢)، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح ص٢٦، و "التدوين المبكر للسنة" للدكتور ماجد أحمد نيازي الدرويش ص١٠.

وَمُحَمَّدُ بْنُ الْحَنَفِيَّةِ، إِلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: «فَنَسْأَلُهُ عَنْ سُنَنِ، رَسُولِ اللَّهِ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَعَنْ صَلَاتِهِ، فَنَكْتُبُ عَنْهُ وَنَتَعَلَّمُ مِنْهُ»[١].

**واته: (عبد الله ومحمد وابن الحنفية) بنەماڵەی (علي بن أبي طالب) ﷺ دەڵێن: دەڕۆیشتین بۆلای هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ (جابر بن عبد الله) ﷺ، پرسیارمان لە سوننەتەکانی پێغەمبەر و نوێژەکەی دەکرد و دەماننووسی و لێی فێر دەبووین.**

وكان عند سليمان بن قيس اليشكري، وأبي الزبير، والحسن البصري صحيفة جابر[٢].

**واته: پەڕاوگەکەی (جابر) لای (سليمان وأبو الزبير وحسن البصري) بوو.**

## ٤. "صحيفة سمرة بن جُندب" ﷺ لە ساڵی (٦٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

قَالَ (ابن سيرين) رحمه الله: «فِي رِسَالَةِ سَمُرَةَ إِلَى بَنِيهِ عِلْمٌ كَثِيرٌ»[٣].

**واته: نامەکەی (سمرة) ﷺ بۆ کوڕەکەی زانستێکی زۆری تێدا بوو.**

## ٥. "صحيفة سعد بن عبادة" ﷺ لە ساڵی (٥)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

**ئیمامی (الترمذي وأحمد) ڕەحمەتی خوایان لێبێت باسی دەکەن کە: «أَنَّهُمْ وَجَدُوا فِي كِتَابِ**

---

(١) "شرح معاني الآثار" للطحاوي (٤/ ٣١٩)، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص١٠٤، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (٥/ ٢٠٦)، و تأريخ دمشق لابن عساكر (٣٢/ ٢٥٩).

(٢) "العلل ومعرفة الرجال" للإمام أحمد (١/ ٣٣٣)، و "تقييد العلم" للبغدادي ص١٠٨، و "الجرح والتعديل" لابن أبي حاتم (٤/ ١٣٦)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٤/ ٢١٥)، و "الضعفاء الكبير" للعقيلي (٤/ ١٣٦)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣٨٢)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٧/ ٢/ ١٨)، و "كتابة السنة في عهد النبي" لرفعت بن فوزي عبد المطلب ص٥٩.

(٣) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٤/ ٢٣٦)، و "الاصابة" لابن حجر (٣/ ١٥٠)، و "الاستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٢/ ٦٥٣)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٢/ ٥٥٤)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (١/ ٢٣٦)، و "التحفة اللطيفة" للسخاوي (١/ ٤٢٧)، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٣٦، و "التدوين المبكر للسنة" للدكتور ماجد أحمد نيازي الدرويش ص١٠، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٤٨، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح ص٢٥.

سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِاليَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ»(١).

واتە: پەڕاوگەکەی (سەعد) باسی ئەوەی تێدا بوو کە شایەتییەك و سوێندخواردنێکی خاوەنەکەی؛ پێغەمبەر ﷺ کاری پێکردووە.

## ٦. "صحيفة علي بن أبي طالب" رضي الله عنه.

ئیمامی (البخاري) رحمه الله لە نۆ شوێنی (صحیح)ەکەیدا هێناویەتی، وەك فەرموودەی (١١١).

وەك (محمد الحنفية)ی کوڕی دەڵێت: باوکم وتی: «خُذْ هَذَا الْكِتَابَ، فَاذْهَبْ بِهِ إِلَى عُثْمَانَ، فَإِنَّ فِيهِ أَمْرَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّدَقَةِ»(٢).

واتە: ئەم نووسراوە ببە بۆ (عوسمانی کوڕی عەففان) رضي الله عنه، جۆرەکانی فەرمانی پێغەمبەری ﷺ تێدایە، بە دابەشکردنی (صدقات).

وە لاپەڕەیەکی کردبووە ناو شمشێرەکەیەوە، «عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: هَلْ عِنْدَكُمْ كِتَابٌ؟ قَالَ: "لاَ، إِلَّا كِتَابُ اللَّهِ، أَوْ فَهْمٌ أُعْطِيَهُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ، أَوْ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ". قَالَ: قُلْتُ: فَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: "العَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ"»(٣).

واتە: وتم: هیچ کتێبێکتان لایە؟ وتی: نەخێر، بێجگە لە قورئان و ئەو لاپەڕە نووسراوە نەبێت کە یاسای ئەسیر و خوێن و نەکوژرانی موسوڵمان بە کافری تێدایە.

---

(١) الترمذي في "سننه" (١٣٤٣)، وصححه الألباني، وأحمد في "مسنده" (٢٢٤٦٠).

(٢) "صحيح البخاري" (٣١١٢)، و"فتح الباري" لابن حجر (٦/ ٢١٥).

(٣) رواه البخاري (١١١)، وأحمد في "المسند" (٥٩٩)، والبزار في "المسند" (٤٨٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٥١)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٥٠٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٧٤٧١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٥٩٠٧)، وابن عبد البر في "الجامع" (٣٩٠).

٧ . "صحيفة رافع بن خديج الأنصاري" رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .

عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، خَطَبَ النَّاسَ، فَذَكَرَ مَكَّةَ وَأَهْلَهَا وَحُرْمَتَهَا، وَلَمْ يَذْكُرِ الْمَدِينَةَ وَأَهْلَهَا وَحُرْمَتَهَا، فَنَادَاهُ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ، فَقَالَ: «**مَا لِي أَسْمَعُكَ ذَكَرْتَ مَكَّةَ وَأَهْلَهَا وَحُرْمَتَهَا، وَلَمْ تَذْكُرِ الْمَدِينَةَ وَأَهْلَهَا وَحُرْمَتَهَا، وَقَدْ حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا**»، " وَذَلِكَ عِنْدَنَا فِي أَدِيمٍ خَوْلَانِيٍّ إِنْ شِئْتَ أَقْرَأْتُكَهُ، قَالَ: فَسَكَتَ مَرْوَانُ، ثُمَّ قَالَ: قَدْ سَمِعْتُ بَعْضَ ذَلِكَ "[1].

واتە: (مەروان) وتاری دا و باسی پلەوپایەی مەککەی کرد، (ڕافع ی کوڕی خدیج) بانگی لێکرد و وتی: بۆچی باسی مەککە و حەرەمەکەی دەکەیت، باسی مەدینە و حەرەمەکەی ناکەیت؟ مەککە گەر حەرەم بێت ئەوا مەدینەش حەرەمە، لامان نووسراوە لە پێستە نووسراوەکەی (خەوەلانی)دا کە پێغەمبەر ﷺ حەرەمی مەدینەی دیاری کردووە لە نێوان هەردوو شاخەکەدا، ئەگەر دەڵێیت بۆت دەخوێنینەوە، (مەروان) وتی: بەڵێ هەندێکیم بیستووە.

٨ . "ألواح عبد الله بن عباس" رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا .

٩ . "عبد الله بن عمر" رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا .

١٠ . "أنس بن مالك" رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .

١١ . "عبد الله بن أبي أوفى" رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .

١٢ . "صحيفة أبي موسى الأشعري" رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .

١٣ . "صحيفة عمرو بن حزم" لأهل اليمن .

---

(١) رواه مسلم (١٣٦١)، وأحمد في "المسند" (١٧٢٧٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٩٩٦٣).

قال (أحمد شاكر) رحمه الله: «إنَّ الكتاب، إسناده صحيح جداً»[(١)].

واته: (أحمد شاكر) دەڵێت: نامەکەی (عمرو بن حزم) بۆ یەمەن سەنەدەکەی (صحيح)ە.

## ١٤. "كتاب النبي ﷺ إلى بكر بن وائل ولحضرموت بواسطة وائل بن حجر"[(٢)].



(١) "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن الأثير (٤/ ٢٩٣)، و "المحلى" لابن حزم (١/ ١٨)، و "السنة المفترى عليها" لسالم البهنساوي ص٦٠، وتعليق أحمد شاكر على كتاب "الرسالة" للشافعي ص٤٢٣.

(٢) بۆ ئەم (صحائف) و نووسینانەی (صحابة) رضي الله عنهم بڕوانە: "كتابة السنة في عهد النبي" لرفعت بن فوزي عبد المطلب ص٥٤، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لناصر بن إبراهيم العبودي ص٣١، و "كتابة الحديث في عهد النبي" لأحمد بن معبد بن عبد الكريم ص١٠، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٧٥، و "بحوث في تأريخ السنة" لأكرم العمري ص٢٢٨، و "تدوين السنة ومنزلتها" لعبد المنعم السيد نجم ص٣٦، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٣٤٣، و "الدفاع عن السنة" جامعة المدينة (١/ ١٥١)، و "السنة المفترى عليها" لسالم البهنساوي ص٥٩.

# نامە و فەرموودە نووسینەکانی هاوەڵان

## (رسائل الصحابة)

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و دابەزینی قورئان تەواو بوو، وە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا خۆی بینییەوە، وە بە هۆکارەکانی نووسین و لەبەرکردن بڵاوبووەوە، قورئان کاتێك بەو قۆناغە هەستیارانەدا تێپەڕ بوو، وە تەواو بوو و ئایەتەکان لە شوێنی خۆیدا جێگیر بوو، وە ئەگەری سڕینەوە (نسخ)ی نەما لەلایەن خواوە بۆ هەندێك لە یاساکان، وە جێگەی خۆی کردەوە لەناو موسوڵمانانداا؛ ئەوکاتە هاوەڵان کەوتنە خەمخۆری کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکوو شیکار و ڕۆشنکەرەوەیەکی قورئان، کە هاوەڵان بە ڕێگەی لەبەرکردنی زارەکی، وە هەندێکیان بە نووسینەوەی پێویستییە گرنگەکان پاراستبوویان، وەکوو ڕێژەکانی زەکات و کێش و وەزنەکانی کڕین و فرۆشتن و ڕێژە و چۆنێتییەکانی بژاردنی خوێن لەناو خەڵکیدا و کۆمەڵێ یاسای قەزاوەت و حوکمەکانی نێوان خەڵکی و ... .

بۆ ئەم مەبەستە زۆر سەرەکییانە هاوەڵان پەراوگەی تایبەتیان هەبوو بۆ کۆکردنەوەی فەرموودە، وەکوو لەمەوپێش چەند نموونەیەکمان خستە ڕوو، وە بە ڕێگەیەکی تریش خەمخواردنی گەیاندنی فەرموودەیان گرتۆتە ئەستۆ، ئەویش نامەنووسینەکانی نێوانیان و دوورەدەستەکانە لە پایتەختی موسوڵمانانەوە، کە لەخۆگری زۆرینەی هاوەڵان و پاشماوەی فەرموودەکانە، دەناسرا و دەنێردرا بۆ بەرفراوانی شوێنانی موسوڵمانان وەکوو هۆکارێکی گەیاندن، بۆیە لای ئیمامی (مالك) رحمه الله کاری دینی دانیشتووانی شاری مەدینە (عمل أهل المدينة) بە یەکێك لە بەڵگەکان هەژماری دەکرد.

ئێستاش بۆ زیاتر متمانە و سەلماندن و دڵنیابوون بۆ ئەوەی کە فەرموودە گەرماوگەرم و زوو بە زوو لەناو چینی هاوەڵاندا خەمخۆری بۆ کراوە و بە زیندوویی ڕاگیراوە تا گەیشتووەتە نووسینەوەی سەربەخۆی خۆی ...، چەند نامەیەکی نێوان هاوەڵان کە هەمووی گەیاندنی فەرموودە و یاسای ئیسلام بووە دەخەینە ڕوو، کە بۆخۆی ئەم نامانە هەموویان تۆمار کراون لە پەرتووکە فەرموودەکاندا، هەر لە (صحيح وسنن ومسانيد) و ئەوانی تریشدا کە بۆخۆی ئەمە بە زیندووڕاگرتنێکی نامەکانە، وەکوو:

**١. نامەی (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه بۆ (عتبة بن مرقد) رضي الله عنه:**

عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ رحمه الله، قَالَ: «جَاءَنَا كِتَابُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَنَحْنُ بِأَذْرَبِيجَانَ: يَا عُتْبَةَ بْنَ فَرْقَدٍ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ، وَزِيَّ أَهْلِ الشِّرْكِ، وَلَبُوسَ الْحَرِيرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ، وَقَالَ: "إِلَّا هَكَذَا" وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِصْبَعَيْهِ»[(١)].

عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ رحمه الله، قَالَ: «كُنَّا مَعَ عُتْبَةَ بْنِ فَرْقَدٍ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ بِأَشْيَاءَ يُحَدِّثُهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَ فِيمَا كَتَبَ إِلَيْهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: "لَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا إِلَّا مَنْ لَيْسَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْهُ شَيْءٌ، إِلَّا هَكَذَا" وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ: السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى»[(٢)].

**واتە: لە هەردوو ڕیوایەتەکەدا (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه نامەی نووسیوە بۆ (ئازەربایجان) کە چەند ئامۆژگارییەکی تێدایە، لەوانە: سەرقاڵنەبوون بە نیعمەتەکانی دونیاوە و نەپۆشینی بەرگی بێبڕوایان و حەریر، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی لە دونیادا حەریر لەبەر بکات، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا بەشی نییە، مەگەر بە هەندەی دوو پەنجە نەبێت.**

**٢. نامەی (معاوية) رضي الله عنه بۆ (عائشة) رضي الله عنها لەسەر شەهیدبوونی ئیمامی (عثمان) رضي الله عنه:**

عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه: «... فَأَخْبَرْتُهُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، فَلَمْ يَرْضَ بِالَّذِي أَخْبَرْتُهُ حَتَّى كَتَبَ إِلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْ اكْتُبِي إِلَيَّ بِهِ، فَكَتَبَتْ إِلَيْهِ بِهِ كِتَابًا»[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٥٨٢٨)، ومسلم (٢٠٦٩)، والنسائي في "الكبرى" (٩٥٥٠)، وأحمد في "المسند" (٩٢) واللفظ له، وابن كثير في "مسند الفاروق" (١/ ٢١٥)، وفي "مستخرج أبي عوانة" (٨٥١٦).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٢٤٣)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، ورواه ابن كثير في "مسند الفاروق" (١/ ٢٠٩)، والخطيب في "الكفاية" ص٣٣٦.

(٣) رواه أحمد في "المسند" (٢٤٥٦٦)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، رجاله ثقات رجال الصحيح، ورواه أيضًا في "فضائل الصحابة" (٨١٦) عن أبي المغيرة.

واته: (نعمان بن بشير) هەواڵی دا بەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی شەهیدبوونی (عثمان بن عفان)ی داوە، (معاوية)ش رضي الله عنه ڕازی نەبوو بەو هەواڵە تا نامەیەکی نووسی بۆ (عائشة) رضي الله عنها، ئەویش بە نامە وەڵامی دایەوە و فەرموودەکەی بۆ نووسی.

عَنِ الشَّعْبِيِّ رحمه الله قَالَ: «كَتَبَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ إِلَى عَائِشَةَ أَنِ اكْتُبِي إِلَيَّ بِشَيْءٍ سَمِعْتِيهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَكَتَبَتْ إِلَيْهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "إِنَّهُ مَنْ يَعْمَلْ بِغَيْرِ طَاعَةِ اللهِ يَعُودُ حَامِدُهُ مِنَ النَّاسِ ذَامًّا"»[1].

واته: (معاوية) رضي الله عنه نامەیەکی نووسی بۆ (عائشة) رضي الله عنها، داوای لێکرد شتێکی بۆ بنووسێ کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوویەتی، ئەویش ئەو فەرموودەیەی بۆ نووسی کە دەفەرموێت: ئەوەی کار بکات بە فەرمانشکاندنی خوا ئەوا هەموو وەسفکارانی لێهەڵدەگەڕێتەوە بۆ زەمکردنی.

**٣. نامەی (مغيرة بن شعبة) رضي الله عنه بۆ (معاوية) رضي الله عنه:**

عَنْ وَرَّادٍ، كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: «أَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ: "لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ"»[2].

واته: (معاوية) رضي الله عنه نامەیەکی لەلایەن (موغیرەی کوڕی شوعبە)وە رضي الله عنه بۆ نووسراوە لەسەر زیکرەکانی دوای نوێژ.

---

(١) "مسند الحميدي" (١/ ٢٩٢) برقم (٢٦٨).

(٢) رواه البخاري (٨٤٤)، وفي "الأدب المفرد" (٤٦٠)، ومسلم (٥٩٣)، وأبو داود (١٥٠٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٦٥)، و "الصغرى" (١٣٤١)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٧٤٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٠٠٦)، وأحمد في "المسند" (١٨١٣٩)، والدارمي في "سننه" (١٣٨٩)، والطبراني في "الكبير" (٨٩٦)، و "الأوسط" (٣٧٠٩)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٣٢٢٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٠٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (٤٦٢٧)، و "السنن الكبرى" (٣٠١٦)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١٥٥٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ١٧٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٧١٥)، والفريابي في "القدر" (١٨٥)، والخطيب في الكفاية ص٣٧٩، وفي "جامع معمر بن راشد" (١٩٦٣٨)، و "مسند الحميدي" (٧٨٠)، و "مستخرج أبي عوانة" (٢٠٧٠)، و "معجم ابن الأعرابي" (٣٨).

**٤.** حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، قَالَ: أَخَذْتُ مِنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ كِتَابًا، زَعَمَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَتَبَهُ لِأَنَسٍ، وَعَلَيْهِ خَاتِمُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ بَعَثَهُ مُصَدِّقًا، وَكَتَبَهُ لَهُ، فَإِذَا فِيهِ: «**هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا نَبِيَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ...**»(١).

**واتە: (ئەبو بەكر) ﷺ كاتێك بووە خەلیفە و (ئەنەس)ی نارد بۆ بەحرەین بۆ دیاریكردنی ڕێژەی زەكات لە حوشتر و مەڕوماڵاتدا بە ووردی.**

**٥.** عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ الْأَنْصَارِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي حَارِثَةَ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ عَامِلًا عَلَى الْيَمَامَةِ، وَأَنَّ مَرْوَانَ كَتَبَ إِلَيْهِ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ كَتَبَ إِلَيْهِ: أَيُّمَا رَجُلٍ سُرِقَ مِنْهُ سَرِقَةٌ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا بِالثَّمَنِ حَيْثُ وَجَدَهَا، قَالَ: فَكَتَبْتُ إِلَى مَرْوَانَ: «**أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى أَنَّهُ إِذَا كَانَ الَّذِي ابْتَاعَهَا مِنَ الَّذِي سَرَقَهَا غَيْرَ مُتَّهَمٍ، خُيِّرَ سَيِّدُهَا، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ الَّذِي سُرِقَ مِنْهُ بِالثَّمَنِ، وَإِنْ شَاءَ اتَّبَعَ سَارِقَهُ**»، قَالَ: وَقَضَى بِذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمْ»(٢).

**واتە: (أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْر) ﷺ نامەیەكی بۆ (مەروان) نووسی كە ئەمیری مەدینە بوو، لەسەر ڕوونكردنەوەی یاسای دزیكردن.**

**٦.** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ مَعَ غُلَامِي نَافِعٍ، أَنْ أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ جُمُعَةٍ عَشِيَّةَ رُجِمَ الْأَسْلَمِيُّ يَقُولُ: «**لَا يَزَالُ الدِّينُ قَائِمًا حَتَّى تَقُومَ**

---

(١) رواه البخاري (٦٩٥٥)، وأبو داود (١٥٦٧) وهذا اللفظ له، وابن ماجه (١٨٠٠)، والنسائي في "الكبرى" (٢٢٣٩)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٢٧٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٢٦٦)، والدارقطني في "السنن" (١٩٨٤)، والحاكم في "المستدرك" (١٤٤١)، والبزار في "المسند" (٤٠)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٣٠٦٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧٢٤٦).

(٢) رواه أبو داود في "المراسيل" (١٩٢)، والنسائي في "الكبرى" (٦٢٣٢)، وأحمد في "المسند" (١٧٩٨٦) واللفظ له، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، ورواه الطبراني في "الكبير" (٥٥٥)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٨٢٩)، والضياء في "المختارة" (١٤٦١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٦٠٩)، و "صحيح وضعيف سنن النسائي" (٤٦٨٠).

السَّاعَةُ، أَوْ يَكُونَ عَلَيْكُمُ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً، كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ» وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «عُصَيْبَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَفْتَتِحُونَ الْبَيْتَ الْأَبْيَضَ، بَيْتَ كِسْرَى "أَوْ" آلِ كِسْرَى»، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ كَذَّابِينَ فَاحْذَرُوهُمْ»، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «إِذَا أَعْطَى اللهُ أَحَدَكُمْ خَيْرًا فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ»، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «أَنَا الْفَرَطُ عَلَى الْحَوْضِ»»[١].

**واتە: (عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا نامەیەك دەنووسێت بۆ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بۆ (جابری کوڕی سەمورە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لەسەر شتێك کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستبێتی، ئەویش ئەو فەرموودانەی بۆ دەنووسێت.**

٧. عَنِ النَّضْرِ بْنِ أَنَسٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ كَتَبَ إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ زَمَنَ الْحَرَّةِ يُعَزِّيهِ، فِيمَنْ قُتِلَ مِنْ وَلَدِهِ وَقَوْمِهِ، وَقَالَ: أُبَشِّرُكَ بِبُشْرَى مِنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «اللهُمَّ اغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ، وَلِأَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، وَلِأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، وَاغْفِرْ لِنِسَاءِ الْأَنْصَارِ، وَلِنِسَاءِ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، وَلِنِسَاءِ أَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ»[٢].

**واتە: (زەید) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نامەی سەرەخۆشی بۆ (ئەنەس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نووسیوە و ئاگاداری فەرموودەیەکی کردووەتەوە لەسەر خۆشەویستی ئەنسارییەکان و داوای لێخۆشبوون بۆیان.**

٨. عَنْ أَبِيهِ سَمُرَةَ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى ابْنِهِ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «كَانَ يَأْمُرُنَا بِالْمَسَاجِدِ أَنْ نَصْنَعَهَا فِي دِيَارِنَا، وَنُصْلِحَ صَنْعَتَهَا وَنُطَهِّرَهَا»[٣].

---

(١) رواه مسلم (١٨٢٢)، وأحمد في "المسند" (٢٠٨٠٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٤٦٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣١٦٥٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٣٨)، وفي "الآحاد والمثاني" (١٤٥٤).

(٢) رواه البخاري (٤٩٠٦)، ومسلم (٢٥٠٦)، والترمذي (٣٩٠٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٨١)، وأحمد في "المسند" (١٩٢٩٩) واللفظ له، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وفي "فضائل الصحابة" (١٤١٩)، ورواه البزار في "المسند" (٤٣٠٩)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٧٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٣٦٢)، والطيالسي في "مسنده" (٧١٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٨١٠)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١٧٤٨).

(٣) رواه أبو داود (٤٥٦)، وصححه الألباني، وأحمد في "المسند" (٢٠١٨٤)، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، ورواه الطبراني في "الكبير" (٧٠٢٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٣٠٩).

وَعَنْ (مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ) رَحِمَهُ اللَّهُ قَالَ: «أَوَّلُ مَنْ دَوَّنَ الْعِلْمَ ابْنُ شِهَابٍ»»[(١)].

واتە: یەکەم کەس کە زانستی کۆکردەوە ئیمامی (الزهري) رَحِمَهُ اللَّهُ بوو.

قسەی ئەم زانایانە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە فەرموودە هیچ کارێکی بۆ نەکراوە، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ تاوەکوو سەردەمی (عمر بن عبد العزيز) رَحِمَهُ اللَّهُ، بەڵام زانیمان کە ئەم جۆرە تێگەیشتنە هەڵەیە، بە بەڵگەی ئەو ڕوونکردنەوانەی پێشوو، لەگەڵ ئەم ڕوونکردنەوەیە کە زانایان مەبەستیان بە (تدوين) کۆکردنەوە بووە، جا بە ڕێگەی کۆکردنەوەی نووسراوەکانەوە بێت، یان لەبەرکردنە زارەکییەکان، لەلایەن کەسانی تایبەت و پڕ متمانە، کەواتە فەرموودە کاری نووسینی بۆ کراوە بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بۆ (عبد الله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، یاخود کەسانی تر لەلایەن خۆیانەوە، وەکوو هاوەڵانی خاوەن پەڕاوگەکان، یان لەبەرکردنێکی تەواوی بەهێز، لەلایەن زانا و ناودار و شارەزا و سەرچاوە دینییەکانی هاوەڵان، وەکوو (عبادلة)کان، چوار (عبد الله) ناوەکە.

## وەڵامی دووەم:

سەنەدی ڕاوییەکان کورت بووە، کەسێك کەوتووەتە نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئیمامەکانی فەرموودەوە، لەبەرئەوە پێویستی بە نووسینەوە و سەنەدی ڕاوی نەکردووە، وە کاتێك فەرموودە کاری نووسینەوەی بۆ کراوە؛ کە زیاتر لە کەسێك کەوتووەتە نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئیمامی کۆکەرەوەی فەرموودەکە و بگرە تا ڕاوییەکان زیادی کردووە مەرج و یاسا و بەرنامەی تایبەتیان زیاتر بۆ دارشتووە.

بۆیە تەنانەت لە سەردەمی ئیمامی (مالك بن أنس)دا رَحِمَهُ اللَّهُ کە لە ساڵی (١٧٩) کۆچی وەفاتی کردووە دەڵێت: «لَقَدْ أَدْرَكْتُ فِي الْمَسْجِدِ سَبْعِيْنَ مِمَّنْ يَقُوْلُ: قَالَ فُلاَنٌ، قَالَ رَسُوْلُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ...»[(٢)].

---

(١) رواه أبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٦٣)، وابن عبد البر في "الجامع" (٤٣٧)، و ابن رجب في "شرح علل الترمذي" (١/ ٣٤٢)، وفي "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٢١١)، و "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٧٦، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٣٢.

(٢) "مسند الموطأ" للجوهري (٣٧)، و "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص١٥٩، و "التمهيد" لابن عبد البر (١/ ٦٧)، و "المسالك" لابن العربي المالكي (١/ ٣٣٥)، و "الوسيط في علوم ومصطلح الحديث" لمحمد بن أبو شُهبة =

واته: گەیشتووم بە حەفتا کەس لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ دەیانوت: فلان کەس وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی.

کەواتە لە سەردەمی ئیمامی (الزهري)دا رحمه الله کەوا هاوەڵان هەندێکیان مابوون، وە زۆری ئەوانەی فەرموودەی لێ وەردەگرتن؛ کەسانی تایبەتی نزیکی هاوەڵان بوون، ئەو کاتەی (عمر بن عبد العزيز) رحمه الله فەرمانی پێ کرد بە کۆکردنەوەی فەرموودە؛ لە نێوان ساڵی (٩٩ بۆ ١٠١)، لەبەرئەوەی (عمر بن عبد العزيز) رحمه الله لە ساڵی (٩٩)ی کۆچییەوە بوو بە خەلیفە، وە لە ساڵی (١٠١)ی کۆچی وەفاتی کرد[1]، ئیمامی (الزهري) رحمه الله کارەکەی تەواو کرد پێش وەفاتی خەلیفە، وەکوو (الخطيب البغدادي) رحمه الله: «وَأُمِرَ النَّاسُ بِحِفْظِ السُّنَنِ إِذِ الْإِسْنَادُ قَرِيبٌ، وَالْعَهْدُ غَيْرُ بَعِيدٍ»[2].

واته: فەرمانی کرد بە نووسینەوەی فەرموودە، سەنەد هێشتا کورت بوو، وە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دوور نەبوو.

وە ئیمامی (الزهري) رحمه الله لە ساڵی (٥٠)ی کۆچی لەدایك بووە، وە لە ساڵی (١٢٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

وە کۆتا صەحابەش کە وەفاتی کردبێت: قَالَ (ابْنُ حَجَر) رحمه الله: «وآخرهم موتا أبو الطّفيل عامر بن واثلة اللّيثي مات سنة مائة من الهجرة، قاله مسلم في صحيحه»[3].

واته: (أبو الطّفيل عامر بن واثلة اللّيثي) بوو کە لە ساڵی سەدی کۆچی وەفاتی کردووە.

---

= ص٦٤، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٥/ ٣٥٢)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٣/ ٤٩٩)، و "تهذيب الكمال" للمزي (١/ ١٦١)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣٤٣)، و "دفاع عن السنة" لمحمد بن أبو شُهبة ص٣٠، و "دراسات في الحديث النبوي" لمحمد ضياء الرحمن الأعظمي ص٢٣، و "ترتيب المدارك" للقاضي عياض (١/ ١٣٦).

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ١٤٤).

(٢) "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص٥٨، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٦٨.

(٣) "الاصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٣/ ١٥٠)، و "فتح الباري" لابن حجر (٧/ ٥)، و "إرشاد الساري" للقسطلاني (٦/ ٥٠)، و "الفتح المبين بشرح الأربعين" لابن حجر الهيتمي ص٣٠٥، و "مناقب الأسد الغالب" لابن الجزري (١/ ٦٢)، و "تحفة الأحوذي" للمباركفوري (٤/ ٢٦٥)، و "مقدمة ابن صلاح" ص٣٠٠، و "التقريب والتيسير" للنووي ص٩٤، و "تدريب الراوي" للسيوطي (٢/ ٦٨٧)، و "مشارق الأنوار الوهاجة" لمحمد بن علي بن آدم (٣/ ٢٧).

وەك لەم ڕیوایەتەدا خۆی دەڵێت: «عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ رَجُلٌ رَآهُ غَيْرِي»(١).

واتە: کەسێك نەماوە لەسەر زەوی کە پێغەمبەری ﷺ بینیبێت، بێجگە لە من.

**نووسینەوە و کۆکردنەوەی فەرمووده‌کانیش لە سەردەمی ئیمامی (الزهري)دا رحمه الله دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو هۆکارە:**

**١.** هۆکاری یەکەم لەلایەن خەلیفە (عمر بن عبد العزيز)ەوەیە رحمه الله، ئەویش وەك خۆی دەڵێت: عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: «كَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، إِلَى أَهْلِ الْمَدِينَةِ أَنْ انْظُرُوا حَدِيثَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاكْتُبُوهُ فَإِنِّي قَدْ خِفْتُ دُرُوسَ الْعِلْمِ وَذَهَابَ أَهْلِهِ»(٢).

واتە: خەلیفە نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی شاری مەدینە، فەرمووی: بگەڕێن چی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەیە بینووسنەوە، من دەترسم لەوەی ئەم زانستە نەمێنێت و خاوەنەکانیان بڕۆن.

دیارە ئەم هەستەی کاتێك بۆ دروست بووە کە (صەحابە)کان ڕێژەیەکی کەمیان ماوە لە ژیاندا، بەتایبەت کەسانی زانا و شارەزایان.

**٢.** هۆکاری دووەم لەلایەن ئیمامی (الزُّهْرِيّ) رحمه الله خۆیەوەیەتی کە دەڵێت: «لَوْلَا أَحَادِيثَ تَأْتِينَا مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ نُنْكِرُهَا لَا نَعْرِفُهَا، مَا كَتَبْتُ حَدِيثًا وَلَا أَذِنْتُ فِي كِتَابِهِ»(٣).

---

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٧٩٠)، ومسلم في "صحيحه" (٢٣٤٠)، قَالَ مُسْلِمُ بْنُ الْحَجَّاجِ: مَاتَ أَبُو الطُّفَيْلِ سَنَةَ مِائَةٍ وَكَانَ آخِرَ مَنْ مَاتَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ورواه أحمد في "المسند" (٢٣٧٩٧)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٢/ ٦١٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٦٤٨)، والفاكهي في "أخبار مكة" (٦٦٤).

(٢) رواه الدارمي في "سننه" (٥٠٥)، والبيهقي في "المدخل" (٧٨٢)، وفي "معرفة السنن والآثار" (١٧٠٦٧)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٢/ ٣٨٧)، والرامهرمزي في "المحدث الفاصل" ص٣٧٣، والخطيب في "تقييد العلم" ص١٠٥، وفي "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٧٥، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٨٦، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٢٩.

(٣) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٥/ ٣٥٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٥/ ٣١٩)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٢٦/ ٤٣٣)، و "تقييد العلم" للخطيب البغدادي ص١٠٧، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص١٥، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٢٦٠.

واتە: ئەگەر هۆکاری هاتنی هەندێك فەرموودەی نەناسراو و بیێنەما نەبوایە لە ڕۆژهەڵاتەوە (واتە عێراق)؛ نەمدەنووسی و ڕێم بە نووسینەوەی نەدەدا.

خەمخۆرییەکەی خەلیفە (عمر بن عبد العزيز) ﵀ بۆ بڵاوبوونەوە و ئاشناکردنی خەڵك بووە بەسەر فەرموودەدا، وەکوو لە نامەیەکدا بۆ (أبو بكر بن حزم)ی ﵀ ناردووە و دەڵێت: «انْظُرْ مَا كَانَ مِنْ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاكْتُبْهُ، فَإِنِّي خِفْتُ دُرُوسَ العِلْمِ وَذَهَابَ العُلَمَاءِ، وَلاَ تَقْبَلْ إِلَّا حَدِيثَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَلْتُفْشُوا العِلْمَ، وَلْتَجْلِسُوا حَتَّى يُعَلَّمَ مَنْ لاَ يَعْلَمُ، فَإِنَّ العِلْمَ لاَ يَهْلِكُ حَتَّى يَكُونَ سِرًّا»[(١)].

واتە: سەیرکە هەرچی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ بینووسەرەوە، لەوە دەترسم زانایان بڕۆن و زانست ونبێت، فەرموودە نەبێت وەری نەگری، تاوەکوو ئەو زانستە بڵاوبێتەوە، کۆڕ بگیرێت بۆ ئەوانەی کە نازانن تا فێر بکرێن، زانست تیاناچێت تاوەکوو شاراوە نەبێت.

ئەم کۆکردنەوە و ڕێکخستنە بە شێوەیەکی فەرمی دەوڵەت مەسرەفی بۆ دابین دەکرد و کەسی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرا و بڵاویان دەکردەوە بەسەر هەموو لایەکی وڵاتدا.

وەکوو ئیمامی (الْزُّهْرِيّ) ﵀ دەڵێت: «أَمَرَنَا عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بِجَمْعِ السُّنَنِ فَكَتَبْنَاهَا دَفْتَرًا دَفْتَرًا، فَبَعَثَ إِلَى كُلِّ أَرْضٍ لَهُ عَلَيْهَا سُلْطَانٌ دَفْتَرًا»[(٢)].

واتە: (عومەری کوڕی عبد العزيز) ﵀ فەرمانی پێ کردین بە کۆکردنەوەی فەرموودە، ئێمەش نووسیمانەوە دەفتەر دەفتەر، واتە بە شێوەیەکی کۆکراوەیی ڕێکخستن بە تەرتیب، پاشان هەر دەفتەرێکی نارد بۆ شوێنێك کە دەسەڵاتداری ئەوی لێبێت.

بەڵام خەمخۆرییەکەی ئیمامی (الزهري) ﵀ لایەنە زانستییەکەی بووە، کە فەرموودە

---

(١) رواه البخاري في "صحيحه" (١/ ٣١) كتاب العلم: بَابٌ: كَيْفَ يُقْبَضُ العِلْمُ، وفي "الرد على من ينكر حجية السنة" لعبد الغني المصري ص٤٧٤، و "مصطلح الحديث" للعثيمين ص٤٥، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٨٥، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٣٠، و "أعلام السيرة النبوية" لفاروق حمادة ص٤.

(٢) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (١/ ٧٦)، و "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير المعلمي ص٢٤٠، و "التأريخ الكبير" لابن أبي خيثمة (٢/ ٢٤٧)، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٨٥، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص٣٣٢.

پارێزراو بێت لەوانەی کە فەرموودە نین، یاخود لەوانەی کە زیادوکەمی پێوە دیارە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە فەرموودە لە ناوچەی حیجازدا پارێزراو بووە لای زانایان و کەسانی تایبەت، بەڵام لە ڕووی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە بە گەیشتنە دەستی (أعجمي)یەکان کە لە بنەڕەتدا عەرەب نین، گۆڕانکاری و شێوازی تایبەتی خۆی ون کردووە، خەمخۆرییەك بۆ پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لای هاوەڵان و تابعین دروست بووە و کاری نووسینەوەی بۆ ئەنجام دراوە و ڕێگەی سەنەدی تایبەتی خاوەنەکانیانی بۆ دیاری کراوە.

کەواتە تا سەردەمی ئیمامی (الزهري) رحمه الله فەرموودە بە شێوەی لەبەرکردن و نووسینەوە لای زانایان و شارەزایانی هاوەڵان و تابعین پارێزراو بووە و زانستی تەواویان بەسەر گشتی فەرموودەدا هەبووە، کە زیاتر لەم بابەتانەی دواتردا دەردەکەوێت.

### وەڵامی سێیەم:

بۆ زیاتر دڵنیابوون لەسەر ئەوەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ گەرماوگەرم لەسەر زار و بینین و تێگەیشتنی هاوەڵاندا ماوە بە بوون و مانیان لە ژیاندا، تا سەردەمی ئیمامی (الزهري) رحمه الله و خەلیفە (عمر بن عبد العزیز) رحمه الله؛ مێژووی وەفاتی هاوەڵان دەخەینە ڕوو کە شاهیدحاڵێکی گەورەیە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانانەی کە دەڵێن سەد ساڵ لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ فەرموودە کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە (مەبەستیان پێی ئەوەیە کە بێ هیچ بنەما و بوونێك نووسراوەتەوە):

یەکەم: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی (١١)ی کۆچی وەفاتی کردووە، یانزە ساڵ لە سەد ساڵ دەرکرێت؛ هەشتاونۆ ساڵ دەمێنێتەوە.

دووەم: مێژووی وەفاتی هاوەڵان رضي الله عنهم [١].

١. (أبو سعيد الخدري) رضي الله عنه: لە ساڵی (٧٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٦٤) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، وە (١٧٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە کە لای فەرموودەناسان تۆمار کراوە.

---

(١) بۆ ئەم بابەتە گەڕانەوە بۆ: "الحديث والمحدثون" لمحمد محمد أبو زهو ص١٣٥، و "تاريخ مولد العلماء ووفياتهم" لأبو سليمان الربعي، و "الوفيات والأحداث" (١/ ٢٠ – ٤٥)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٣٥٥ – ٤٦٣).

**٢. (أبو هريرة) رضي الله عنه: لە ساڵی (٥٧)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٤٦) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (٥٣٧٤) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**٣. (جابر بن عبد الله) رضي الله عنه: لە ساڵی (٧٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٦٨) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، وە (١٥٤٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**٤. (أنس بن مالك) رضي الله عنه: لە ساڵی (٩٣)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٨٣) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (١٢٨٦) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**پێغەمبەر ﷺ بەتایبەت دوعای بۆ کردووە و فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ، أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَأَطِلْ عُمُرَهُ، وَاغْفِرْ لَهُ»[(١)].**

**واتە: خوای پەروەردگار ماڵی زیاد بکەیت و منداڵی زۆر بکەیت و تەمەنی درێژ بکەیت.**

**قَالَ مُوَرِّقٌ الْعِجْلِيُّ رحمه الله: «... كَانَ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ إِذَا خَالَفَنَا فِي الْحَدِيثِ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْنَا لَهُ: تَعَالَ إِلَى مَنْ سَمِعَهُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[(٢)].**

**واتە: (مووەریق) رحمه الله دەڵێت: ئەگەر یەکێك لە بیدعەکاران پێچەوانەمان بوایە لە فەرموودەدا؛ دەمان وت: وەرە با بڕۆین بۆلای کەسێك کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوویەتی، دەچوونە لای (ئەنەسی کوڕی مالیك) رضي الله عنه.**

**شەش ساڵ دوای وەفاتی (ئەنەس) ئیمامی (عومەری کوڕی عبد العزيز) رحمه الله بووە بە خەلیفە.**

**٥. (عائشة) رضي الله عنها: خێزانی پێغەمبەر ﷺ، لە ساڵی (٥٧)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٤٦) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (٢٢١٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**٦. (عبد الله بن عباس) رضي الله عنهما: لە ساڵی (٦٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٥٨) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (١٦٦٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

---

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٦٥٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٢٣٦)، وابن عساكر في "معجمه" (١٣٠٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٥٤١).

(٢) "تأريخ الكبير" للبخاري (٢/ ٢٨)، و "المعجم الكبير" للطبراني (٧١٩)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٩/ ١٠٩).

پێغەمبەر ﷺ دوعای تایبەتی بۆ کردووە و فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ»[(١)]، وفي رواية: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ»[(٢)].

واتە: خوایە شارەزای بکەی لە دیندا و زانستی تەفسیری قورئان و حیکمەتی پێ ببەخشیت.

ئەم صەحابە بەڕێزە هەر لەدوای وەفاتی پێغەمبەرەوە ﷺ خەمخۆری کۆکردنەوەی فەرموودەکان بووە، وەك خۆی دەیگێڕێتەوە: «لَمَّا قُبِضَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْتُ لِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: هَلُمَّ فَلْنَسْأَلْ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّهُمْ كَثِيرٌ، قَالَ: الْعَجَبُ لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَتَرَى النَّاسَ يَحْتَاجُونَ إِلَيْكَ وَفِي الْأَرْضِ مَنْ تَرَى مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَتَرَكَ ذَلِكَ، وَأَقْبَلْتُ عَلَى الْمَسْأَلَةِ وَتَتَبُّعِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنْ كُنْتُ لَيَبْلُغُنِي الْحَدِيثُ عَنْ رَجُلٍ سَمِعَ الْحَدِيثَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ فَأَجِدُهُ قَائِلًا: "فَأَتَوَسَّدُ رِدَائِي عَلَى بَابِهِ تَسْفِي الرِّيَاحُ فِي وَجْهِي حَتَّى يَخْرُجَ" ، فَيَقُولُ: مَا جَاءَ بِكَ يَا ابْنَ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ؟ فَأَقُولُ: "بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْكَ" ، فَيَقُولُ: فَهَلَّا بَعَثْتَ إِلَيَّ حَتَّى آتِيَكَ، فَأَقُولُ: "أَنَا كُنْتُ أَحَقَّ أَنْ آتِيَكَ" ، فَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلُ يَمُرُّ بِي بَعْدُ، وَالنَّاسُ يَسْأَلُونِي فَيَقُولُ: أَنْتَ كُنْتَ أَعْقَلَ مِنِّي»[(٣)].

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد (ئەوکاتە تەمەنی لەنێوان دوانزە بۆ پانزە ساڵ

---

(١) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٧٠٥٥)، وأحمد في "المسند" (٢٣٩٧)، وفي "فضائل الصحابة" (١٥٦٠)، والحاكم في "المستدرك" (٦٢٨٠)، والبزار في "المسند" (٥٠٧٥)، والطبراني في "الكبير" (٥٤٢)، وفي "الأوسط" (١٤٢٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٢٢٣)، واسحاق بن راهويه في "مسنده" (٢٠٣٨)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٣٨٠)، والآجري في "الشريعة" (١٧٤٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٥٨٩).

(٢) رواه البخاري (٣٧٥٦)، والترمذي (٣٨٢٤)، والنسائي في "الكبرى" (٨١٢٣)، وابن ماجه (١٦٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٠٥٤)، وأحمد في "المسند" (٢٤٢٢)، وفي "فضائل الصحابة" (١٩٢٣)، والطبراني في "الكبير" (١٠٥٨٨)، وفي "الأوسط" (٧٧٠٢)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٣٧٥)، والآجري في "الشريعة" (١٧٤٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣١٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٩٤٣).

(٣) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (١٩٢٥)، والدارمي في "سننه" (٥٩٠)، والحاكم في "المستدرك" (٣٦٣)، والبيهقي في "المدخل" (٦٧٣).

بووە، وەکوو لە (حجة الوداع)دا دەڵێت: «وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الْاِحْتِلَامَ» واتە: ئەوکاتە نزیکی باڵغبوون بووم، وە پێغەمبەر ﷺ بە ماوەیەکی کەم دوای ئەو ساڵەی کە حەجی کرد وەفاتی کرد)، بە پیاوێکی ئەنصاریم وت: هەستە با بەیەکەوە پرسیار لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەین لە هاوەڵان، ئەمڕۆ ئەوان زۆرن، ئەویش وتی: تۆ سەیری (ابن عباس)، تۆ بڵێی خەڵك پێویستی بە تۆ بێت و ئەم هەموو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەوین؟! ئەو وازی هێنا، بەڵام من ڕۆیشتم بەدوای پرسیارکردندا و شوێنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەکەوتم، ئەگەر فەرموودەیەکم ببیستایە کە لای هاوەڵێکی پێغەمبەرە ﷺ، دەڕۆیشتم جلەکەم ڕادەخست و لەسەری دادەنیشتم لە بەردەرگاکەیاندا و خۆڵ و تۆز دەهات بە ڕوومدا تا دەهاتە دەرەوە، کە منی دەبینی دەیوت: ئامۆزاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی هاتووی؟ دەموت: پێم گەیشتووە کە فەرموودەیەکت لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە، پێم خۆش بوو لێتی ببیستم، ئەویش دەیوت: بۆچی نەتنارد بەدوامدا تا من بێم بۆ لات؟ منیش دەموت: من لەپێشترم بێم بۆ لات، لەدوای ئەمانە دادەنیشتم و خەڵك پرسیاری لێ دەکردم، ئەو پیاوە کە دەیبینیم دەیوت: تۆ لە من ژیرتر بوویت.

٧. (عبد الله بن عمر بن الخطاب) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: لە ساڵی (٧٣)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٦٢) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (١٦٣٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، تەمەنی نزیکەی (٨٧) ساڵ بووە.

عَنْ (مَالِكٍ) رَحِمَهُ اللَّهُ أَنَّهُ قَالَ: «أَقَامَ ابْنُ عُمَرَ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتِّيْنَ سَنَةً تَقَدَّمَ عَلَيْهِ وُفُود النَّاس»[1].

واتە: ئیمامی (مالیکی کوڕی ئەنەس) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا شەست ساڵ پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دانیشت بۆ گەیاندنی دین، نوێنەری خەڵکی ڕووی تێدەکرد.

وَعَنْ (الزُّهْرِيّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «فَإِنَّهُ أَقَامَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سِتِّينَ سَنَةً، فَلَمْ يَخْفَ

(١) رواه البيهقي في "المدخل" (١٢٢)، وفي "تهذيب الكمال" للمزي (١٥/ ٣٣٩)، و "تأريخ بغداد" للخطيب (١/ ٥٢١)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٣/ ٣٣٦)، و "الحديث والمحدثون" لمحمد أبو زهو ص١٤١.

عَلَيْهِ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا مِنْ أَمْرِ أَصْحَابِهِ»[١].

واتە: هیچ شتێکی لە کاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لێ شاراوە نەبوو.

**٨.** (عبد الله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: **لە ساڵی (٦٣)ی کۆچی لە میصر وەفاتی کردووە، (٤٣) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، (٧٠٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**٩.** (عبد الله بن مسعود) ﷺ: **لە ساڵی (٣٢)ی کۆچی وەفاتی کردووە، (٨٤٨) فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

**١٠.** (أبو الطفيل عامر بن واثلة) ﷺ: **لە ساڵی (١٠٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە[٢]، وە** (خارجة بن زيد) **لە ساڵی (٩٩)ی کۆچی وەفاتی کردووە.**

**١١.** (سائب بن زيد) ﷺ: **(٨٤) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە.**

**وە** (مرثد بن عبد الله) ﷺ **(٧٩) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاوە، وە** (سهل بن سعد) ﷺ **(٨١) ساڵ، وە** (عبد الله بن جعفر) ﷺ **(٨٠) ساڵ، وە** (سلمة بن الأكوع) ﷺ **(٦٤) ساڵ، وە** (رافع بن خديج) ﷺ **(٦٤) ساڵ، وە** (سعيد بن خالد الجهني) ﷺ **(٦٣) ساڵ، وە** (أسماء بنت أبي بكر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا **(٦٣) ساڵ، وە** (عوف بن مالك) ﷺ **(٦٣) ساڵ، وە** (البراء بن عازب) ﷺ **(٦٢) ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ ژیاون ...**[٣].

**بەم شێوەیە ڕوون بووەوە کە بوونی هاوەڵان ﷺ مانای بوون و بەزیندووڕاگرتنی فەرموودە بووە، وە هەر بوونیشیان بووە کە بووەتە هۆکاری نەنووسینەوەی فەرموودە، بۆیە بە نەمانی هاوەڵان بیر لە نووسینەوە کراوەتەوە، کەواتە کەسێك زیاتر لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و نووسینەوەدا**

---

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (٦٣٦٣)، وفي "تذكرة الحفاظ" للذهبي (١/ ٣٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣١/ ١٦٤)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (١/ ٢٧٩)، و "تهذيب الكمال" للمزي (١٥/ ٣٣٩)، و "الاصابة" لابن حجر (٤/ ١٥٩)، و "الحديث والمحدثون" لمحمد أبو زهو ص١٤١.

(٢) لە "الوفيات والأحداث" (١/ ٤٠)، دا دەڵێت: ساڵی (١١٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

(٣) "دراسات في الحديث النبوي" للأعظمي ص١٠٧، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٣٥٥ - ٤٦٣).

نەبووە، وە گەر بە قوتابییەکانی هاوەڵانەوە بگاتە دوو کەس بە نووسینەوە لە هاوەڵانەوە.

**وەڵامی چوارەم:**

**فەرموودە هەمووی پێکهاتە نییە لە قسەکردنەکانی پێغەمبەر ﷺ.**

قَالَ (ابن الوزير) رَحِمَهُ اللهُ: «واعلم أن الأحاديث الصحيحة ليست كلها قولية، بل منها ما هو إخبار عن أفعال النبي صلى الله عليه وسلم وهي كثيرة. ومنها ما أصله قولي، ولكن الصحابي لا يذكر القول بل يقول: أمرنا النبي صلى الله عليه وسلم بكذا، أو نهانا عن كذا، أو قضى بكذا، أو أذن في كذا.. وأشباه هذا. وهذا كثير أيضاً. وهذان الضربان ليسا محل نزاع، والكلام في مايقول الصحابي فيه: قال رسول الله كيت وكيت، أو نحو ذلك»[1].

واتە: (ابن الوزير) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئەوە بزانە کە فەرموودە (صحيح)ەکان هەموویان وتەیی نین، هەندێکیان هەواڵ دەدەن لەسەر کارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەمە زۆربەیانە، وە لە هەندێکیشیاندا قسەیە لە بنەمادا، بەڵام صەحابەکە قسەکە باس ناکات، بەڵکوو دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداین بەو کارە، یاخود ڕێگری لێکردین لەو کارە، یاخود فەرمانی لەسەر ئەو شتە بەو شێوەیە دەرکرد، یاخود ڕێگەی دا بەو کارە ... و هاوشێوەی ئەمانە، ئەمەش ڕێژەیەکی زۆرە، ئەم دوو جۆرە هیچ جیاوازییەکی لەسەر نییە، بەڵام قسە لەسەر ئەوەیانە کە صەحابەیەك دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەوە و ئەوە ... .

وە ئەو هەڕەشەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[2]. واتە: هەرکەسێك درۆ بە دەمی منەوە بکات بەبێ هیچ پاساوێك؛ با شوێنێك لە ئاگر بۆ

---

(١) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٧٩.

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٩٣٥٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث متواتر، وهذا إسناد قوي، رجاله ثقات رجال الصحيح غير كليب، وهو ابن شهاب بن المجنون الجرمي، روى له أصحاب السنن، وهو قوي الحديث، ورواه إسحاق بن راهويه في "مسنده" (٢٦٤) عن المغيرة بن سلمة، عن عبد الواحد بن زياد، بهذا الإسناد، والدارمي في "السنن" (٦١٣) من طريق صالح بن عمر، عن عاصم بن كليب، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٥)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦٠٣)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٥٩)، وابن كثير في "البداية والنهاية" (١١/ ٣٧١)، وفي كتاب "أبو هريره راوية الإسلام" ص١١١.

خۆی دابنێت، مەبەست پێی وەکوو (ابن الوزير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وتشديده صلى الله عليه وسلم في الكذب عليه إنما المراد به الكذب في المعاني، فإن الناس يبعثون رسلهم ونوابهم ويأمرونهم بالتبليغ عنهم، فإذا لم يشترط عليهم المحافظة على الألفاظ فبلغوا المعنى فقد صدقوا: ولو قلت لابنك اذهب فقل للكاتب: أبي يدعوك. فذهب وقال له: والدي- أو الوالد - يدعوك، أو يطلب مجيئك إليه، أو أمرني أن أدعوك له، لكان مطيعاً صادقاً، ولو اطلعت بعد ذلك على ما قال فزعمت أنه عصى أو كذب وأردت أن تعاقبه لأنكر العقلاء عليك ذلك. وقد قص الله عز وجل في القرآن كثيراً من أقوال خلقه بغير ألفاظهم، لأن من ذلك ما يطول فيبلغ الحد المعجز، ومنه ما يكون عن لسان أعجمي، ومنه ما يأتي في مواضع بألفاظ وفي آخر بغيرها، وقد تتعدد الصور كما في قصة موسى، ويطول في موضع ويختصر في آخر. فبالنظر إلى أداء المعنى كرر النبي صلى الله عليه وسلم بيان شدة الكذب عليه، وبالنظر إلى أداء اللفظ اقتصر على الترغيب فقال "نضر الله امرأً سمع منا شيئاً فأداه كما سمعه، فرب مبلغ أوعى من سامع" »[١].

واته: هەڕەشەکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر درۆکردنە بە مانا و مەبەست، خەڵکی کاتێك نوێنەر و نامەیان دەنێرن فەرمانیان پێ دەکەن فەرمانەکەیان بگەیەنن، بە مەرجیان نەگرتووە هەموو وشەکانیان وەکوو خۆی بەبێ گۆڕانکاری بگەیەنن، ئەگەر مانا و مەبەست بگەیەنن ئەوا ڕاستیان کردووە، گەر منداڵەکەت بنێریت بۆ لای نووسەرەکەت و پێی بڵێت باوکم بانگت دەکات، ئەویش وتی: باوکم دەڵێت بێت بۆ لام، یاخود داوای هاتنت دەکات، ئەوا ڕاستی پێکاوە و گوێڕایەڵ بووە، وە ئەگەر پاشان پیاچوونەوەی قسەکان بکەیت و تۆمەتی درۆ و تاوان بخەیتە پاڵی و سزای بدەیت؛ ئەوا هەرچی ژیر هەیە دژایەتیت دەکات، ئەی نابینیت خوای گەورە لە قورئاندا قسەی زۆرێك لە دروستکراوەکانی دەگێڕێتەوە بەبێ وشەکانی خۆیان، لەبەر درێژخایەنی، وە هەیانە بە زمانی عەرەبی نەبووە، وە لە شوێنێکدا بە جۆرێکە و لە شوێنێکی تریشدا بە جۆرێکی ترە، وەك چیرۆکی موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ، وە لە هەندێکدا بە درێژی و لە هەندێکدا بە کورتییە، بە تێڕوانین لەسەر گەیاندن بە مانا و مەبەست پێغەمبەری خوا ﷺ هەڕەشەی کردووە بە توندی لەسەر

(١) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٧٨.

درۆکردن بە دەمیەوە، وە بە تێڕوانین لەسەر گەیاندن بە (وشە) وەکوو خۆی کورتی کردووەتەوە لەسەر هاندان، فەرموویەتی: خوای گەورە ڕووی کەسێك گەشاوە بکات کە شتێك لە ئێمەوە دەبیستێت و دەیگەیەنێت بەو شێوەیەی کە بیستوویەتی، ڕەنگە ئەوەی پێی دەگات شارەزاتر بێت لەوەی کە بیستوویەتی.

قَالَ (ابْنُ سِيرِينَ) رَحِمَهُ اللهُ: «كُنْتُ أَسْمَعُ الْحَدِيثَ مِنْ عَشَرَةٍ، الْمَعْنَى وَاحِدٌ وَاللَّفْظُ مُخْتَلِف»، ... وَقَالَ أَبُو أُوَيْسٍ: «سَأَلْنَا الزُّهْرِيَّ عَنِ التَّقْدِيْمِ وَالتَّأْخِيْرِ فِي الحَدِيْثِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا يَجُوْزُ فِي القُرْآنِ، فَكَيْفَ بِهِ فِي الحَدِيْثِ؟ إِذَا أُصِيْبَ مَعْنَى الحَدِيْثِ، وَلَمْ يُحِلَّ بِهِ حَرَاماً، وَلَمْ يُحَرِّمْ بِهِ حَلاَلاً، فَلاَ بَأْسَ»، وَعَنْ وَكِيعٍ قَالَ: «إِنْ لَمْ يَكُنِ الْمَعْنَى وَاسِعًا فَقَدْ هَلَكَ النَّاسُ»، وقد استدل الشافعي لذلك بحديث: «أنزل القرآن على سبعة أحرف» ...[(١)].

واتە: (ابن سيرين) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: من فەرموودەم لە دە کەسەوە بیستووە و یەك مانا بووە و داڕشتنەکانیان جیاواز بووە، وە پرسیار لە ئیمامی (الزهري) رَحِمَهُ اللهُ دەکرێت لەسەر پێشخستن و دواخستن لە فەرموودەدا، وتی: ئەو شێوەیە دروست بووە لە قورئاندا، چۆن لە فەرموودەدا دروست نییە؟ وە ئیمامی (وکیع) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئەگەر لە ماناد‌ا بەرفراوانی نەبێت خەڵك تیاچووە، ئیمامی (شافعی) رَحِمَهُ اللهُ حەوت جۆر خوێندنەوەی قورئان بۆ ئەم مەبەستە دەکاتە بەڵگە.

لەگەڵ ئەوەشدا: «القرآن مع أن ألفاظه مقصودة لذاتها لأنه كلام رب العالمين بلفظه ومعناه، معجر بلفظه ومعناه، متعبد بتلاوته، فما بالك بالأحاديث التي مدار المقصود الديني فيها على معانيها فقط؟»[(٢)].

---

(١) "العلل الصغير" للترمذي ص٧٤٦، و "فتح المغيث" للسخاوي (٣/ ١٣٨، ١٤٤)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٥٣٥، ٥٣٦)، و "قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث" للقاسمي ص٢٢١، و "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٨٢، و "الوسيط في علوم ومصطلح الحديث" لأبو شهبة ص١٤٦، و "المعرفة والتأريخ" لأبو يوسف الفسوي (٢/ ٦٤)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٨/ ٢٤١)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٧/ ١٤٤، ١٩٤)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٣/ ١٨٩)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ٣٤٧).

(٢) "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٧٧.

واتە: مەبەست لە قورئاندا وشە و جۆری داڕشتن و ماناکەیەتی، لەبەرئەوەی فەرموودەی خوای پەروەردگارە بەو وشەو مانایەوە، وە موعجیزەییەکەیشی بە مانا و وشەوەیە، وە خوێندنەوەی عیبادەتە، بە پێچەوانەی فەرموودەوە کە مەبەستی دینی تیایدا گەیاندنی مانا و مەبەستەکانە.

قال الدكتور (نور الدين عتر): «وذهب جمهور العلماء ومنهم الأئمة الأربعة إلى جواز الرواية بالمعنى من مشتغل بالعلم ناقد لوجوه تصرف الألفاظ إذا انضم لاتصافه بذلك أمران:

١. أن لا يكون الحديث متعبدا بلفظه.
٢. ولا يكون من جوامع كلمه صلى الله عليه وسلم، وهذا هو الصحيح المعتمد»[(١)].

واتە: ڕای زۆری زانایان لەوانەش خاوەنی چوار مەزهەبەکە لەسەر ئەوەیە کە فەرموودە بە ماناوە بگێڕیتەوە، بە دوو مەرج:

یەکەم: فەرموودەکە خوێندنەوەیەکی عیبادەتی نەبێت، وەکوو (ذکر وتشهد وصلوات ودعاء ...).

دووەم: فەرموودەکە لە قسە کورت و پڕماناکانی پێغەمبەر ﷺ نەبێت، کە مەبەست پێی گەیاندنی ئەو جۆرە داڕشتنەیە لەڕووی بەهێزی و گشتگیرییەوە.

ئەم ڕێگەپێدانەش «إنما كان في عصور الرواية قبل تدوين الحديث، أما بعد تدوين الحديث في المصنفات والكتب فقد زال الخلاف ووجب اتباع اللفظ»[(٢)].

واتە: ئەو ڕێگەپێدانەش لە سەردەمی ڕیوایەت و کۆکردنەوەی فەرموودەدا بووە، بەڵام دوای کۆکردنەوەی فەرموودە ئەو جیاوازییەی نێوان زانایان نەماوە و بە پێویست کراوە شوێنکەوتەی وشە و داڕشتنەکان بن.

---

(١) "منهج النقد في علوم الحديث" للدكتور نور الدين عتر ص٢٢٧، وانظر في هذا الموضوع "الإلماع" ص١٧٤ – ١٧٨، و "كشف الأسرار" ص٧٧٤، ٧٧٩، و "شروح التوضيح" (٢/ ١٣)، و "فواتح الرحموت" (٢/ ١٦٧)، و "شرح التحرير" لابن أمير حاج (٢/ ٢٨٥ – ٢٨٨)، و "شرح العضد على مختصر ابن الحاجب" (٢/ ٧٠ – ٧١)، و "شروح جمع الجوامع" (٢/ ١٠٦ – ١٠٧).

(٢) "منهج النقد في علوم الحديث" للدكتور نور الدين عتر ص٢٢٧.

قَالَ (الْأَعْمَشُ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «كَانَ هَذَا الْعِلْمُ عِنْدَ أَقْوَامٍ كَانَ أَحَدُهُمْ لَأَنْ يَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَزِيدَ فِيهِ وَاوًا أَوْ أَلِفًا أَوْ دَالًا»[١].

**واتە: ئەم زانستە لای كەسانێك بووە كە هەریەكەیان پێی خۆش بووە لە ئاسمان بكەوێتە خوارەوە، بەڵام واوێك یان ئەلفێك یان دالێك لە فەرموودەكە زیاد نەكات.**

**هەروەك** (عبد الله بن مسعود) رضي الله عنه أَنَّهُ حَدَّثَ يَوْمًا بِحَدِيثٍ فَقَالَ: «سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ أَرْعَدَ وَأَرْعَدَتْ ثِيَابُهُ وَقَالَ: أَوْ نَحْوَ هَذَا أَوْ شِبْهَ هَذَا»[٢].

**واتە: (ابن مسعود) كاتێك فەرموودەیەكی گێڕایەوە كە وتی: بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، دەلەرزی و جلەكانیشی دەلەرییەوە، پاشان وتی: بەم شێوەیە بوو فەرموودەكەی، یان هاوشێوەی ئەمە بوو.**

وَعَنْ (أَبِي الدَّرْدَاءِ) رضي الله عنه، أَنَّهُ: «كَانَ إِذَا حَدَّثَ الْحَدِيثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ فَرَغَ مِنْهُ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ لَمْ يَكُنْ هَكَذَا فَكَشَكْلِهِ»[٣]، وفي رواية: «هَذَا أَوْ نَحْوِ هَذَا أَوْ شَكْلَهُ»[٤].

**واتە: (أبو الدرداء) رضي الله عنه ئەگەر فەرموودەیەكی بگێڕایەتەوە پاشان دەیوت: خوایە گەر وا نەبوو**

---

(١) "الكفاية" للخطيب البغدادي ص١٧٧، و "توثيق السنة" لرفعت بن فوزي عبد المطلب ص٤٢٠، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص١٢٩، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح ص٨٢.

(٢) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (٤٦٢)، و "المسند" للشاشي (٣٩٤)، "الكفاية" للخطيب البغدادي ص٢٠٥، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٣/١١٦)، و "فتح المغيث" للسخاوي (٣/١٤٨)، و "منهج النقد في علوم الحديث" للدكتور نور الدين عتر ص٢٢٩.

(٣) رواه الدارمي في "سننه" (٢٩١)، وابن عبد البر في "الجامع" (٤٥٩)، والخطيب في "الكفاية" ص٢٠٥، وفي "الجامع لأخلاق الراوي" (١١٠٦)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٤٧/ ١٤٤)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٤/ ٢٠) وفي "العلل ومعرفة الرجال" للإمام أحمد (١/ ١٥٨)، و "سير السلف الصالحين" لإسماعيل بن محمد الأصبهاني ص٥٥٤، و "منهج النقد في علوم الحديث" للدكتور نور الدين عتر ص٢٢٩، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص١٣٠.

(٤) رواه الدارمي في "سننه" (٢٩٠)، والطبراني في "مسند الشاميين" (٧٩٠)، والخطيب في "الكفاية" ص٢٠٥، وفي "الجامع لأخلاق الراوي" (١١٠٥)، والسيوطي في "تحذير الخواص من أكاذيب القصاص" ص٩٨، والرامهرمزي في "المحدث الفاصل" ص٥٥٠، والسخاوي في فتح المغيث (٣/ ١٤٨)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٤٧/ ١٤٤)، وفي "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج الخطيب ص١٣٠.

ئەوا هاوشێوەی ئەو بوو، لە ڕیوایەتەکەی تردا: بەم شێوەیە یان هاوشێوە یان شێوازی ئەمە بوو.

وَكَانَ (أَنَسٌ) إِذَا حَدَّثَ حَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَفَرَغَ مِنْهُ قَالَ: «أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[(١)].

واتە: (ئەنەسی کوڕی مالیك) ﷺ گەر فەرموودەیەکی بگێڕایەتەوە کاتێك تەواو دەبوو دەیوت: یان بە هاوشێوەی ئەمە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی.

وَقَالَ (عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى): «أَدْرَكْتُ مِائَةً وَعِشْرِينَ مِنَ الأَنْصَارِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا مِنْهُمْ أَحَدٌ يُحَدِّثُ بِحَدِيثٍ إِلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ إِيَّاهُ»[(٢)].

واتە: (ابن أبي ليلى) دەڵێت: سەدوبیست هاوەڵم بینیوە هەریەکەیان ئاواتی ئەوە بوو ئەوێتر فەرموودەکە بگێڕێتەوە و بیخاتە ئەستۆی خۆی، یاخود فەتواکە بدات.

وَعَنِ (الشَّعْبِيِّ) ﷺ قَالَ: «جَالَسْتُ ابْنَ عُمَرَ سَنَةً. فَلَمْ أَسْمَعْهُ يَذْكُرُ حَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[(٣)].

(١) رواه ابن ماجه (٢٤)، وأحمد في "المسند" (١٣١٢٤)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، والدارمي في "سننه" (٢٨٤)، والحاكم في "المستدرك" (٦٤٥٦)، والطبراني في "الأوسط" (٦١٤٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٢٢٣)، وابن عبد البر في "الجامع" (٤٦١)، والخطيب في "الكفاية" ص٢٠٦، وفي "الجامع لأخلاق الراوي" (١١٠٨)، والسيوطي في "تدريب الراوي" (١/ ٥٣٨)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٧/ ١٥)، وابن عدي في "الكامل" (١/ ٩٣)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٩/ ٣٦٦)، والمزي في "تهذيب الكمال" (٣/ ٣٧٠)، وصححه الألباني في "صحيح وضعيف سنن ابن ماجه" (٢٤).

(٢) رواه ابن حبان في "الثقات" (١٦٠٧٥)، والدارمي في "سننه" (١٣٧)، والبيهقي في "المدخل" (٨٠٠)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢١٩٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٣٠٥)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٦/ ١٦٦)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٣٦/ ٨٦)، وابن مبارك في "الزهد" (٥٨)، وزهير بن حرب في "العلم" (٢١)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٢/ ٩٦٦)، وفي "سير أعلام النبلاء" (٥/ ١٥٠)، وابن حجر في "التلخيص" (٤/ ٤٥٤)، وفي "منهاج المحدثين" لعلي عبد الباسط مزيد ص٧٨، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٣٢، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٩٤.

(٣) رواه ابن ماجه (٢٦)، والدارمي في "سننه" (٢٨١)، والطبراني في "الكبير" (١٣٧٠٤)، والرامهرمزي في "المحدث الفاصل" ص٥٥١، وفي "تحفة الأشراف بمعرفة الأطراف" للمزي (٥/ ٤٤١)، و "إتحاف المهرة" لابن حجر (٥/ ١٥٨)، و =

واتە: ئیمامی (شەعبی) دەڵێت: ساڵێك لەگەڵ (ابن عمر) دانیشتم فەرموودەیەکی نەگێڕایەوە.

وَعَن السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ، قَالَ: «خَرَجْتُ مَعَ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ إِلَى مَكَّةَ فَمَا سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ حَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ»(١).

واتە: لەگەڵ (سعد) ڕۆیشتم بۆ مەککە، گوێم لێ نەبوو فەرموودەیەك بگێڕێتەوە تا گەڕاینەوە مەدینە.

وَعَن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: «لَوْلَا أَنِّي أَخْشَى أَنْ أُخْطِئَ لَحَدَّثْتُكُمْ بِأَشْيَاءَ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ قَالَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَذَاكَ أَنِّي سَمِعْتُهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ" »(٢).

واتە: ئەگەر لە ترسی هەڵەکردن نەبوایە چەند شتێکم بۆ دەگێڕانەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوومە، بەڵام من بیستوومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ئەوەی درۆ بەناوی منەوە بکات بەبێ پاساو؛ با شوێنێك بۆ خۆی دابنێت لە ئاگردا.

## گومانی دووەم: قال الله تبارك وتعالى: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحِجر: ٩].

**دەوترێت:** خوای گەورە وادەی پاراستنی قورئانی داوە بەبێ فەرموودە، ئەگەر فەرموودە بەڵگە بوایە ئەوا فەرموودەش وادەی پاراستنی دەدرا وەکوو قورئان.

= "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٤/ ١٠٨)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٤/ ٣٠٩)، و "مشارق الأنوار الوهاجة" لمحمد بن علي بن آدم (١/ ٣٧٥)، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٣١، و "منهاج المحدثين" لعلى عبد الباسط مزيد ص١٢٥، و "الحديث والمحدثون" لمحمد أبو زهو ص٦٨.

(١) رواه الدارمي في "سننه" (٢٨٦)، وفي "إتحاف المهرة" لابن حجر (٥/ ١٥٨)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٢٠/ ٣٦٢)، و "مشارق الأنوار الوهاجة" لمحمد بن علي بن آدم (١/ ٤٠٢)، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٣٢.

(٢) رواه الدارمي في "سننه" (٢٤١)، وفي "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٢٠١)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٨١)، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٣١.

**وەڵام بۆ ئەمە:**

قَالَ (ابن حزم) رَحِمَهُ اللهُ: «هذه دعوى كاذبة مجردة من البرهان وتخصيص للذكر بلا دليل ... والذكر اسم واقع والذكر اسم واقع على كل ما أنزل الله على نبيه صلى الله عليه وسلم من قرآن أو من سنة وحي يبين بها القرآن وأيضا فإن الله تعالى يقول ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ فصح أنه عليه السلام مأمور ببيان القرآن للناس وفي القرآن مجمل كثير كالصلاة والزكاة والحج وغير ذلك مما لا نعلم ... فإذا كان بيانه عليه السلام لذلك المجمل غير محفوظ ولا مضمون سلامته مما ليس منه فقد بطل الانتفاع بنص القرآن فبطلت أكثر الشرائع المفترضة علينا فيه فإذا لم ندر صحيح مراد الله تعالى منها»[1].

واته: (ابن حزم الأندلسي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئەمە قسەیەك و بڕیارێكی درۆی بێ بەڵگەیە، كە دەیخەنە پاڵ ئەوەی خوای گەورە بەس وادەی پاراستنی قورئانی داوە بەبێ فەرمووده ... لەگەڵ ئەوەشدا وشەی (الذكر) به هەموو ئەو شتانە دەوترێت كە خوای گەورە ناردوویەتییە سەر پێغەمبەرەكەی ﷺ، لە قورئان بێت یاخود سوننەت كە وەحییەكە بۆ ڕوونكردنەوەی قورئانە، وەكوو دەفەرموێت: ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، واته: قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ ئەوەی ڕوونی كەیتەوە بۆ خەڵكی، كەواتە پێغەمبەر ﷺ فەرمانپێكراوە بە ڕوونكردنەوەی قورئان بۆ خەڵكی، لە قورئانیشدا كورتە باسێكی زۆر هەیە، وەكوو نوێژ و زەكات و حەج ... ئەوانەی وورده‌كاری نازانین، ئەگەر ڕوونكارەكانی ئەو كورتە باسانە پارێزراو نەبێت، وە هیچ متمانەیەكی سەلامەتی نەبێت؛ ئەوا سوودوەرگرتن لە قورئان بەتاڵە، بەوەش زۆری فەرزەكانی شەریعەت بەتاڵ دەبێتەوە لەسەرمان ئەگەر دەرك نەكەین بە مەبەستە دروستەكانی خوا ﷻ.

عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: «كُنَّا عِنْدَ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، وَهُمْ يَتَذَاكَرُونَ الْحَدِيثَ، فَقَالَ رَجُلٌ: دَعُونَا مِنْ هَذَا وَجِيئُونَا بِكِتَابِ اللَّهِ فَقَالَ عِمْرَانُ: إِنَّكَ أَحْمَقُ، أَتَجِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ الصَّلَاةَ مُفَسَّرَةً؟ أَتَجِدُ فِي

---

(١) "الإحكام في أصول الأحكام" لابن حزم (١/ ١٢٢).

كِتَابِ اللهِ الصِّيَامَ مُفَسَّرًا؟ إِنَّ الْقُرْآنَ جَمَعَ ذَلِكَ، وَالسُّنَّةُ تُفَسِّرُ ذَلِكَ»(١).

**واته: لای هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ (عمران بن حصين) ﷺ دانیشتبووین، باسی فەرموودەمان دەکرد، پیاوێك وتی: وازمان لێ بێنە لەمانە، باسی کتێبی خوامان لەگەڵ بکە، (عمران) وتی: تۆ کەم عەقڵێیت، ئەوە لە کتێبی خوادا نوێژ بە شیکراوەیی هاتووە؟ ئەوە ڕۆژوو بە شیکراوەیی هاتووە؟ قورئان بە کورتی هێناویەتی و سوننەت شیکاریەتی.**

وَقَالَ (محمد رشيد رضا) رحمه الله: «وَالْجُمْهُورُ عَلَى أَنَّ الْأَحْكَامَ الشَّرْعِيَّةَ الْوَارِدَةَ فِي السُّنَّةِ مُوحًى بِهَا، وَأَنَّ الْوَحْيَ لَيْسَ مَحْصُورًا فِي الْقُرْآنِ»(٢).

**واته: (محمد رشيد رضا) رحمه الله دەڵێت: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئەو یاسا شەرعییانەی لە سوننەتدا هاتووە وەحییە و وەحیش بەس بۆ قورئان نییە.**

**هۆکاری ئەم هەڵە تێگەیشتنەشیان لەوەدایە کەوا گومان دەبەن بەوەی فەرموودە دەبێت وەحی بێت، وەکوو چۆن قورئان وەحییە و بە هۆکاری (جبریل)ەوەیە عليه السلام و بەو شێوەیە قورئان بپارێزرێت و بنووسرێتەوە، هیچ کەسێکیش نەتوانێت هاوشێوەی بێنێت، جیانەکردنەوەی ئەم دوو جۆرە وەحییەش هۆکاری کەوتنە ناو ئەم گومڕاییەیە.**

**پاشان ئەوان بە چ بەڵگەیەك ووشەی (ذکر) کورت دەکەنەوە لەسەر قورئان و فەرموودەی لێ دەردەکەن گەر هەریەکەیان پاراستنی جیاوازە؟!**

قِيلَ لِابْنِ الْمُبَارَكِ: هَذِهِ الْأَحَادِيثُ الْمَصْنُوعَةُ؟ قَالَ: «تَعِيشُ لَهَا الْجَهَابِذَةُ، ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحجر: ٩]»(٣).

---

(١) "أدب الاملاء والاستملاء" للمروزي ص٤، و "الاعتبار في الناسخ والمنسوخ من الآثار" للحازمي ص٢٥، و "مفتاح الجنة" للسيوطي ص٥٩.

(٢) "تفسير المنار" لمحمد رشيد رضا (٨/ ٢٧٤) في تفسير سورة [الأعراف: آية: ٣].

(٣) "فتح المغيث للسخاوي" للسخاوي (١/ ٣١٩)، و "الكفاية" للخطيب البغدادي ص٣٦، و "الموضوعات" لابن الجوزي (١/ ٤٦)، و "مقدمة ابن صلاح" ص٦، و "شرح علل الترمذي" لابن رجب (١/ ٤٧٧)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٣٣٣)، و "السنة ومكانتها" للسباغي ص٢٨٠، و "الأنوار الكاشفة" لابن الوزير ص٩٢، و "الجرح والتعديل" لابن أبي حاتم (١/ ٣)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ١٩٢)، و "منهج النقد" للدكتور نور الدين عتر ص٤٨٤.

واتە: بە (عبد الله ی کوڕی موبارەك)یان وت: ئەم فەرموودانە دروستکراون؟ وتی: ناوداریان بۆ هەڵدەکەوێت، ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە وادەی پاراستنی قورئانی داوە.

پاشان دەبینین خوای پەروەردگار ئەو هەموو زانا فەرموودەناسانەی دروستکردووە لە کات و شوێنی تایبەتدا و کات و شوێنی بۆ ڕەخساندوون بۆ کۆکردنەوەی ووردودرشتی کار و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، تەنانەت وتەی هاوەڵانیشی، وە زانست و یاسا و بەرنامەی تایبەت تەرخان کراوە بۆ خزمەتی کۆکردنەوە و پاڵفتەکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ.

## گومانی سێیەم: قال الله تبارك وتعالى: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ [الأنعام: ٣٨].

دەوترێت: خوای پەروەردگار باس لەوە دەکات کەوا دەفەرموێت: هیچ شتێك نییە لە قورئاندا پەراندبێتمان و باس نەکرابێت، کەواتە چ پێویستمان بە سوننەت و فەرموودە هەیە؟

### وەڵام بۆ ئەمە:

پێش هەموو شتێك ﴿فِي الْكِتَابِ﴾ لەم ئایەتەدا مەبەست پێی قورئان نییە، بەڵکوو مەبەست پێی (اللوح المحفوظ)ە، کە خوای پەروەردگار هەموو ووردەکارییەکی تێدا تۆمار کردووە، نە لێی زیاد دەکرێت، وە نە لێشی کەم دەکرێت، بە بەڵگەی ئەوەی سەرەتای ئەم ئایەتە باس لە دروستکراوەکان دەکات کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [الأنعام: ٣٨].

ئیمامی (القرطبي) رحمه الله دەڵێت: «قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ أَيْ: فِي اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ»[1].

وَقَالَ (ابن عباس) رضي الله عنهما: « ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ [الأنعام: ٣٨]: مَا تَرَكْنَا شَيْئًا إِلَّا قَدْ كَتَبْنَاهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ»[2].

---

(١) "تفسير القرطبي" (٦/ ٤٢٠) في تفسير سورة [الأنعام: آية: ٣٨].

(٢) "تفسير الطبري" (٩/ ٢٣٤) في تفسير سورة [الأنعام: آية: ٣٨]، و "تفسير ابن أبي حاتم" (٧٢٥٩)، و "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ١٣١).

وَقَالَ (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ: « ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾ أَيِ: الْجَمِيعُ عِلْمُهُمْ عِنْدَ اللهِ»[١].

وَقَالَ (السعدي) رَحِمَهُ اللَّهُ: « ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾ أي: ما أهملنا ولا أغفلنا، في اللوح المحفوظ شيئا من الأشياء»[٢].

یاخود دەڵێن: خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ [النحل: ٨٩].

واتە: قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شتێك.

ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «والبيان اسم جامع لمعاني مجتمعةِ الأصول، متشعبةِ الفروع: ... منها: ما أَحكم فرضه بكتابه، وبيَّن كيف هو على لسان نبيه؟ مثل عدد الصلاة، والزكاة، ووقتها ... ومنها: ما سَنَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم مما ليس لله فيه نصُّ حكم، وقد فرض الله في كتابه طاعة رسوله صلى الله عليه وسلم»[٣].

واتە: ڕوونکردنەوە (البيان) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ بنەمایەك کە چەندەها پەلی لێبووبێتەوە، هەیانە فەرزە، کردنەکەی باس کردووە لە قورئاندا و چۆنێتییەکەی لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ ڕوون کردووەتەوە، وەکوو نوێژ و زەکات و ژمارەی ڕکاتەکان و کاتەکانی ...، وە هەیانە لە قورئاندا دەقێك نییە لەسەری، بەڵکوو فەرمانی داوە بە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

قَالَ (الْخَطَّابِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «البيان على ضربين بيان جلي تناول الذكر نصا وبيان خفي اشتمل عليه معنى التلاوة ضمناً فما كان من هذا الضرب كان تفصيل بيانه موكولا إلى النبي صلى الله عليه وسلم وهو معنى قوله سبحانه: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ۝٤٤﴾ [النحل: ٤٤] فمن جمع بين الكتاب والسنة فقد استوفى وجهي البيان»[٤].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٢٥٣) في تفسير سورة [الأنعام: آية: ٣٨].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٢٥٥، في تفسير سورة [الأنعام: آية: ٣٨].

(٣) "الرسالة" للشافعي ص٢١.

(٤) "معالم السنن" للخطابي (١/ ٨).

واتە: ڕوونکردنەوە دوو جۆرە: ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرا لە قورئاندا کە بە دەق هاتووە، وە ڕوونکردنەوەیەکی شاراوە کە مانا و مەبەستەکانی قورئان دەیگرێتەوە، ئەوەی لەم جۆرە بێت ئەوا شیکردنەوە دووروودرێژەکەی خراوەتە سەر شانی پێغەمبەر ﷺ، ئەوەی قورئان و فەرموودە بۆخۆی کۆبکاتەوە ئەوا هەردوو جۆرە ڕوونکردنەوەکەی کۆکردووەتەوە.

## گومانی چوارەم:

دەوترێت: بەڵگەکانی دین دەبێت دڵنیایی و متمانەدار بێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەس قورئان شوێنی (قطعي الثبوت) واتە دڵنیاییە، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ [البَقَرَة: ١، ٢]، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ [فَاطِر: ٣١].

هەردوو ئەم ئایەتە باس لەوە دەکات کەوا قورئان حەق و بێ گومانە.

بەڵام فەرموودە: وەکوو زانایان دەڵێن پێکهاتووە لە (متواتر وآحاد)، ئەوەی کە (متواتر)ە ئەوە شوێنی دڵنیاییە و ژمارەیان زۆر کەمە، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە هەمووی (آحاد)ە کە شوێنی (ظني الثبوت)ە، واتە شوێنی گومانە لە بەڵگەکاریدا، وە گومانیش ناتگەیەنێتە حەق، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكۡثَرُهُمۡ إِلَّا ظَنًّاۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا﴾ [يُونُس: ٣٦]، کەواتە بە تەنها قورئان دینە.

### وەڵام بۆ ئەم گومانەش:

زانایان دەڵێن: «أن القرآن الكريم قطعي الثبوت، ولكنه ليس قطعي الدلالة في كل المواضع»[(١)].

واتە: بە دڵنیاییەوە قورئان شوێنی دڵنیایی بەڵگەییە، لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە شوێنی دڵنیایی مانای هەموو بەڵگەکارییەکان بێت.

---

(١) "دراسات في الحديث النبوي" للأعظمي ص٣٤، و "شرح الحموية" ليوسف الغفيص (٦/٦)، و "موسوعة الألباني في العقيدة" (١/ ٣٨٢)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٣٧٧)، وفي "فتاوى الشبكة الإسلامية" (٢٣/ ١٠٤).

کەواتە بەشێکی زۆری هەر شوێنی گومانە، وە تاکە سەرچاوەش کە یەکلاکەرەوە بێت فەرموودەیە.

لەلایەکی تریشەوە: «فإن حُجِيَّة خبر الآحاد ليست ظنية بل هي مقطوع بها لانعقاد الإجماع على ذلك بين العلماء منذ عصر الصحابة فمن بعدهم»[(١)].

واتە: فەرموودەکانی (آحاد) شوێنی گومان نییە بەو مانایەی کە نەکرێتە بەڵگە، بەڵکوو کۆدەنگی زانایان لەسەر بەڵگەبوونیەتی، هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە و تا دوای ئەوانیش.

## گومانی پێنجەم:

کۆمەڵێکی تر لەو گومانانە وەکوو: ڕێگری کراوە لە فەرموودە نووسینەوە و کەمکردنەوەی گێڕانەوەی لەلایەن هاوەڵانەوە، وە فەرموودە وەحی نییە و شوێنی ڕەخنەی زانایانە لەڕووی سەنەد و مەتنەوە ... وە چەندەها گومانی تر کە وەڵامی هەموویان لەم بابەتەی دوای ئەمەدا خۆی دەبینێتەوە.



(١) "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ١٩٦)، و"الأحكام" للآمدي (١/ ١٦٩)، و"الإحكام" لابن حزم (١/ ١١٤).

# بەڵـگـەیەتـی فـەرمـوودە

## (حجية السنة)

**واتای بەڵگەیەتی فەرموودە (حجیة السنة):** «معناها: أن السنة حجة، وأنه يجب العمل بها، فهي حجة من حجج الله تعالى على خلقه، مصدر من مصادر التشريع بعد القرآن الكريم»[1].

واتە: فەرموودە بەڵگەیە و پێویستە کاری پێ بکرێت، بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی خوا بەسەر دروستکراوەکانییەوە، وە سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی شەریعەت پاش قورئان.

### دانانی فەرموودە بە سەرچاوەی بەڵگە بابەتێکی ئیمانی و بیروباوەڕی و قورئانییە:

**ئیمانییە:** بەو مانایەی ئیمان وەستاوە لەسەر ڕاست و دروستی ئەم بابەتە.

**بیروباوەڕییە:** ئەمە بەشێکە لە بیروباوەڕمان بە ئیسلام و لێپرسینەوەی لەسەرە.

**قورئانییە:** بەو واتایەی قورئان زۆر گرنگی و سەلماندنی پێداوە، بە چەندەها شێواز و بابەت بە بوونی.

**بەم سێ بابەتە دوو خاڵی سەرەکی دەسەلمێنرێت:**

**یەکەم:** گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ واجبێکی دینییە.

**دووەم:** خودی پێغەمبەر ﷺ خۆی شیکەرەوە و ڕوونکەرەوەی قورئانە، ئەم دوو خاڵە پەیوەستن بەیەکەوە.

**بۆ یەکەم:** کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ ئەرك و واجبێکی دینییە، دەبینین لە قورئاندا بە چەندەها شێواز و داڕشتن و داواکاری ئەم بابەتەی باسکردووە، وەکوو:

١. بەشـێوەی بـاوەڕهێنان بە پێغەمبەران بە گشتی، وە باوەڕهێنانیش بۆ پەیوەستبوون پێوەی، وە

---

(١) "الدفاع عن السنة" ص٤٩، و "السنة النبوية" لمحمد بن عبد الله ص٣٥، و "حجية السنة" لعبد الغني عبد الخالق ص٢٤٣.

وەرگرتنی دینە لێی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ [آل عمران : ١٧٩]، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ﴾ [الحديد : ١٩].

باوەڕهێنان بە خوا و پێغەمبەران عليهم السلام.

٢. بەشێوەی تایبەتتر داوای باوەڕهێنان دەکات پێی و بە بەرنامەکەی، وەکوو دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ [النساء : ١٣٦].
واتە: ئیمانداران ئیمان بێنن بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەو کتێبەی ناردوویەتییە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەو مانایەی کە گوێڕایەڵی بکرێت، نەك باوەڕهێنان بەتەنها.

٣. زۆر بە ئاشکراتر فەرمان دەدات بە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ بە بەسەرچاوەگرتنی، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ [النساء : ٦٤].
واتە: پێغەمبەرێکمان نەناردووە بێجگە لەوە نەبێت کە گوێڕایەڵی بکرێت.

٤. بۆ زیاتر دڵنیابوون، پەیوەستی کردووە بە گوێڕایەڵی خۆیەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢﴾ [آل عمران : ٣٢].
واتە: ئەی (محمد ﷺ) پێیان بڵێ گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن، وە گەر پشت هەڵکەن ئەوا خوای گەورە بێبڕوایانی خۆش ناوێت.

٥. وە بۆ تایبەتکردن بە تەنیا ناوی بردووە لە گوێڕایەڵیکردندا، وەکوو دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾ [النساء : ٦٥]، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ [الحشر : ٧].
واتە: سوێند بە خوا ئیمانیان تەواو نییە تاوەکوو تۆ نەکەنە حاکم و یەکلاکەرەوە لە هەموو کارەکانیاندا، وە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێتان دەگەیەنێت لێی وەرگرن، وە ئەوەی ڕێگریتان لێ دەکات کۆتایی پێ بێنن.

بۆ دووەم: ڕوونکاری قورئان پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەبەرئەوەی لە نێوان خوا ﷻ و پێغەمبەر ﷺ (جبریل) ﵇ سەرچاوەی وەرگرتنی وەحییە، وە لە نێوان (جبریل) و خەڵکیدا پێغەمبەر (ﷺ)ە، چۆن ناشێت هەموو کەس پێغەمبەر بێت تا لە (جبریل)ەوە وەری بگرێت؛ ئاواش نابێت لە هیچ کەسێکەوە وەرگیرێت بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ نەبێت.

لەبەرئەوەی ئەو بۆی دابەزیوە و خاوەنیەتی و شارەزاترین کەسە بەسەریدا، وەك خۆی دەفەرموێت: «إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللهِ أَنَا»[(١)].

واتە: خواناسترین و شارەزاترینتان بە خوا منم.

وە دەفەرموێت: «وَاللهِ إِنِّي لَأَعْلَمُكُمْ بِاللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَأَتْقَاكُمْ لَهُ قَلْبًا»[(٢)].

واتە: سوێند بە خوا من لە هەمووتان شارەزاترینم بە خوا و لە هەمووشتان زیاتر خواناسیم لە دڵدا هەیە بۆی.

بۆیە خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [النحل: ٤٤].

واتە: قورئانمان بۆ ناردوویتەتە خوارەوە تا ڕوونی کەیتەوە بۆ خەڵکی، «لِعِلْمِكَ بِمَعْنَى مَا أُنْزِلَ عَلَيْكَ»[(٣)]، لەبەرئەوەی زانستت هەیە بە مانای دابەزێندراوەکە بۆت، کە (قورئان)ە.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ [إبراهيم: ٤].

واتە: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێت بە زمانی گەلەکەی بووە، تا بۆیان ڕوون بکاتەوە.

وە دەبێت گەیاندنی دین هەر لەسەر زمانی ئەوەوە بێت، وەکوو خوای ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ [المائدة: ٦٧].

---

(١) رواه البخاري (٢٠).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٢٤٣١٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وصححه الألباني في "الصحيحة" تحت حديث رقم (٣٥٠٢).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٥٧٤).

واته: ئەی پێغەمبەر بیگەیەنە ئەوەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆت لەلایەنی خواوە.

  

# فـەرمـووده ( وەحــی )یە

# ( الـسنة وحــيٌّ )

**جۆرەکانی وەحی (أنواع الوحي):** قال الله تبارك وتعالى: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ٥١﴾ [الشورى : ٥١].

**وەحی سێ جۆرە، دوو جۆریان بەبێ هۆکارە و یەکێکیان بە هۆکارەوەیە:**

**١. قوله تعالى:** ﴿إِلَّا وَحۡيًا﴾: ئەم وەحییە بەبێ هۆکارە و لە دوو شێوازدا دەبێت:

**أ.** لەکاتی بەئاگابووندا: ئەویش خستنە ناو دڵەوەیە (إلهام)، خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت:

﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِ﴾ [النحل : ٤٤].

واتە: وەحیمان نارد بۆ دایکی موسا کە شیری بداتێ.

وەکوو زۆری ئەو حاڵەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ئاگادار کراوەتەوە.

**ب.** لە خەودا: وەکوو خەوبینینەکەی (إبراهيم) بۆ سەربڕینی (إسماعيل) ﵉، وەکوو خوای گەورە ﷻ لە قورئاندا باسی دەکات: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ﴾ [الصافات : ١٠٢].

یاخود خەوبینینەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ گرتنەوەی مەککە، وەکوو خوای گەورە ﷻ باسی دەکات: ﴿لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ [الفتح : ٢٧].

**٢. قوله تعالى:** ﴿أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ﴾: لەپشت پەردەوە.

وەکوو قسەکردنەکانی (موسا) ﵇ لەگەڵ خوای گەورە ﷻ لەسەر کێوی (طور)، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ [الأعراف : ١٤٣].

یاخود شەوی میعراجی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت:

﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ١٠﴾ [النجم : ١٠].

**٣. قوله تعالى:** ﴿أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا﴾: بە ناردنی نێردراوێك (ملائكة)، وەكوو (جبريل) عليه السلام، ئەمیش بەشێوەی تەواوی خۆی، یاخود لەسەر شێوەی ئادەمیزادێك، یاخود بەبێ هیچ شێوەیەك، بەڵام پاشماوەی دەنگ و كاریگەری هەبووە لەسەر پێغەمبەر ﷺ بە هاتنی، كە دەورووبەری ئەمەیان هەست پێكردووە بەبێ بینینی لەسەر هیچ شێوەیەك(١).

## بەڵگەكانی قورئان لەسەر (وەحی) بوونی فەرمووده

**ئایەتی یەكەم:** قال الله تعالى: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩﴾ [القيامة: ١٦ - ١٩].

خوای پەروەردگار پێغەمبەرەكەی دڵنیا دەكاتەوە لەسەر كۆكردنەوەی قورئان و پاراستنی.

(ابن كثير) رحمه الله دەڵێت: «وَتَكَفَّلَ لَهُ أَنْ يَجْمَعَهُ فِي صَدْرِهِ، وَأَنْ يُيَسِّرَهُ لِأَدَائِهِ عَلَى الْوَجْهِ الَّذِي أَلْقَاهُ إِلَيْهِ، وَأَنْ يُبَيِّنَهُ لَهُ وَيُفَسِّرَهُ وَيُوَضِّحَهُ. فَالْحَالَةُ الْأُولَى جَمْعُهُ فِي صَدْرِهِ، وَالثَّانِيَةُ تِلَاوَتُهُ، وَالثَّالِثَةُ تَفْسِيرُهُ وَإِيضَاحُ مَعْنَاهُ»(٢).

واتە: خوای پەروەردگار متمانەی لەبەركردنی پێدا لە سنگیدا، وە گەیاندنی بەو شێوەیەی كە پێی گەیشتووە، وە ڕوونكردنەوە و شەرحكردنی.

**مەبەست لە ئایەتەكە:** ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ﴾، واتە لەسەر ئێمەیە ڕوونكردنەوەی.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ١٩﴾ [القيامة: ١٩] يَقُولُ: «حَلَالَهُ وَحَرَامَهُ، فَذَلِكَ بَيَانُهُ»(٣)، وَفِي رِوَايَةٍ قَالَ: «تِبْيَانَهُ بِلِسَانِكَ»(٤).

واتە: ڕوونكردنەوەی لەسەر زمانی تۆ.

كەواتە هەموو ڕوونكردنەوەكانی عیبادەتەكان و لایەنە یاساییەكان لە حەڵاڵ و حەرام و ... پێویستییەكانی دینی لە هەموو بوارەكاندا كە قورئان ئاماژەی بە هەمووی داوە؛ خوای گەورە

---

(١) "الاتقان" للسيوطي (١/ ٤٤)، و "مناهل العرفان" للزرقاني (١/ ٤٨ – ٥٠).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٢٧٨) في تفسير سورة [القيامة]، و "الدر المنثور" للسيوطي (٨/ ٣٤٨).

(٣) (٤) "تفسير الطبري" (٢٣/ ٥٠٤) في تفسير سورة [القيامة: آية: ١٩].

وادەی داوە کە خۆی لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی ڕوونی بکاتەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ پاشان لەسەر ئێمەیە ڕوونکردنەوەی، وە پێغەمبەریش ﷺ زانستی ئەو هەموو وردەکارییەی پێ نییە گەر خوای گەورە فێری نەکات و زانای نەکات بەسەریدا.

کەواتە هەموو فەرموودە و ڕوونکردنەوە و هەواڵەکانی و بگرە کارەکانیشی وەحییە و تەفسیر و ڕوونکردنەوەی قورئانە، وەك (عائشة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: «كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ»[(١)].

وَعَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، قَالَ: «سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ خُلُقِ، رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: " أَمَا تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ فَقُلْتُ: بَلَى. فَقَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَهُ كَانَ الْقُرْآنَ "»[(٢)].

واتە: (سەعدی کوڕی هیشام) دەڵێت: پرسیارم لە (عائیشە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا کرد دەربارەی خووڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش وتی: ئایا قورئانت نەخوێندووەتەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: دە خووڕەوشتی قورئان بوو.

قَالَ (ابن حزم) رَحِمَهُ اللَّهُ: «فأخبر تعالى أن بيان القرآن عليه عز وجل، وإذا كان عليه فبيانه من عنده تعالى، والوحي كله متلوه وغير متلوه فهو من عند الله عز وجل»[(٣)].

واتە: (ابن حزم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: خوای گەورە هەواڵی داوە کەوا ڕوونکردنەوەی قورئان لەسەر ئەوە، وە گەر لەسەر ئەو بێت؛ ئەوا وەحی خوێندنەوە (قورئان) و نەخوێندنەوە (واتە فەرموودە) لەلایەن خواوەیە.

---

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٣٠٨)، وصححه الألباني، وفي "خلق أفعال العباد" ص٨٧، وأحمد في "المسند" (٢٥٨١٣)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والطبراني في "الأوسط" (٧٢)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٤٣٤)، والبيهقي في "الشعب" (٣/ ٢٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣/ ٧٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٤٨١١).

(٢) رواه مسلم (٧٤٦)، وأبو داود (١٣٤٢)، والنسائي في "الكبرى" (٤٢٤)، وفي "الصغرى" (١٦٠١)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١١٢٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٥٥١)، وأحمد في "المسند" (٢٤٦٣٦)، والدارمي في "سننه" (١٥١٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣٨٤٢)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٨٦٢)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٤٧١٤)، واسحاق بن راهويه في "مسنده" (١٣١٦)، والبيهقي في السنن الكبرى (٤٣٠٨)، وفي "الشعب" (١٣٥٩).

(٣) "الإحكام في أصول الأحكام" لابن حزم (١/ ٨٢).

**ئایەتی دووەم:** قال الله تعالى: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ [آل عمران: ١٦٤].

خوای گەورە نیعمەتی خۆی باس دەكات بەسەر ئیمانداراندا كە پێغەمبەرێكی بۆ ناردوون لە خۆیان، ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە و پاكیان دەكاتەوە و شارەزایان دەكات بەسەر قورئان و سوننەتدا.

**مەبەست لە ئایەتەكە:** وشەی ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ كە پاش ﴿ٱلْكِتَٰبَ﴾ە، واتە قورئان ناوی بردووە، زانایان لە تەفسیریدا دەڵێن: مەبەست پێی سوننەتە، واتە كار و فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ، وەك (ابن كثیر) و (السعدي) دەڵێن: «**الْحِكْمَةُ: السُّنَّةُ**»(١).

وَقَالَ (الْحَسَنُ وقَتَادَةُ): «**الْحِكْمَةُ: السُّنَّةُ**»(٢).

وَقَالَ (الطَّبَرِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «وَيَعْنِي بِالْحِكْمَةِ السُّنَّةَ الَّتِي سَنَّهَا اللهُ جَلَّ ثناؤُهُ لِلْمُؤْمِنِينَ عَلَى لِسَانِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيَانَهُ لَهُمْ»(٣).

واتە: ئیمامی (الطبري) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: حیكمەت لە ئایەتەكەدا سوننەتەكانی پێغەمبەرە ﷺ، كە لەسەر زمانییەوە ڕوونكراوەتەوە.

وە ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «سَمِعْتُ مَنْ أَرْضَى مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالقُرْآنِ يَقُوْلُ: الْحِكْمَةُ سُنَّةُ رَسُوْلِ اللهِ»(٤).

واتە: لە شارەزایانی قورئانەوە بیستوومە كە دەڵێن: حیكمەت واتە سوننەتەكانی پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (١/ ٧٠٠)، و "تفسير السعدي" ص١٠٣، ٨٦٢.

(٢) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (١/ ٨٢) برقم (٦٩)، و "الإبانة الكبرى" لابن بطة (١/ ٣٤٤) برقم (٢١٧)، و "شرح السنة" للبغوي (١/ ٢٠٢)، و "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (٧٠، ٧١)، و "تفسير القرطبي" (٢/ ١٣١)، و "الدر المنثور" للسيوطي (١/ ٣٣٥).

(٣) "تفسير الطبري" (٦/ ٢١٢).

(٤) "الرسالة" للشافعي ص٧٣.

**ئاشکرایە کە ئەمە مەبەستی ئایەتەکەیە، لەبەرئەوەی[(١)]:**

**١-** خوای گەورە وشەی قورئان و حیکمەتی بەیەکەوە باسکردووە، بەیەکەوە و بەشێوەی جیا و پیتی (و)ی گەڕاندنەوە (عطف)ی لەنێوانیاندا داناوە، بۆ جیاکاری لەنێوانیاندا، وە ناشبێت بێجگە لە سوننەتی مەبەست بێت، لەبەرئەوەی لە سوننەت بەهێزترمان نییە بۆ شیکردنەوەی قورئان.

**٢-** خوای گەورە لە باسی منەتکردندا بەسەر ئیمانداراندا باسی کردووە و ئەم جۆرەش گەر حەق و ڕاست نەبێت بەم شێوەیە باسی ناکات، واتە بوونی سوننەت.

**٣-** قورئان واجبە شوێنکەوتەی، وە سوننەتیشی بە حیکمەت ناوبردووە، کەواتە واجبە شوێنکەوتەی.

**٤-** هەموو داواکارییەکانی قورئان شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتە، وە ناشبێت مەبەستی بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەکان بێت.

بۆیە بەشێوەی دابەزین باس لە حیکمەت دەکات کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ١١٣﴾ [النساء: ١١٣]، ﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ﴾ [البقرة: ٢٣١]، کەواتە حیکمەت کە فەرموودەیە وەکوو قورئان دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە دەبێت بلێت: ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ [الأنعام: ٥٠]، ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّي﴾ [الأعراف: ٢٠٣]، من شوێنکەوتەی وەحیم.

**ئایەتی سێیەم:** قال الله تعالى: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾ [النحل: ٤٤].

قَالَ (ابْنُ كَثِير) رَحِمَهُ اللَّهُ: « ﴿قَوْلِه تَعَالَى: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ﴾ يَعْنِي: الْقُرْآنَ، ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ مِنْ رَبِّهِمْ، أَيْ: لِعِلْمِكَ بِمَعْنَى مَا أُنْزِلَ عَلَيْكَ»[(٢)].

---

(١) "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٥١).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٥٧٤) في تفسير سورة [النحل: آية: ٤٤].

واتە: قورئانمان بۆ ناردوویتەتە خوارەوە بۆئەوەی شیكار و ڕوونكاری بیت، لەبەر ئەو زانستەی كە پێمان بەخشیویت بەسەر قورئاندا.

ئیمامی (القرطبي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «فَالرَّسُولُ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُبَيِّنٌ عَنِ اللهِّ عَزَّ وَجَلَّ مُرَادَهُ مِمَّا أَجْمَلَهُ فِي كِتَابِهِ ...»(١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونكاری مەبەستەكانی خوایە لەو شتانەی كە بە كورتی باسی كردووە.

زیاتریش مەبەست لە ئایەتەكە ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی ڕوونی كەیتەوە بۆ خەڵكی، گەر ڕوونكردنەوەكان لەلای خواوە نەبێت؛ دەبێت لەكوێوە بێت بۆلای پێغەمبەر ﷺ ؟ كە خۆی پێكهاتەی قورئان بەگشتی كورتەباسە بۆ شتەكان، واتە (مجمل)ە.

**ئایەتی چوارەم:** قال الله تعالى: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ [النِّسَاءِ: ١٠٥].

قَالَ (الطنطاوي) رَحِمَهُ اللهُ: «أي: إنا أنزلنا إليك يا محمد القرآن الكريم، إنزالا ملتبسا بالحق وبالعدل لكي تحكم بين الناس في قضاياهم بما أراك الله، أي بما عرفك وأعلمك وأوحى به إليك وقوله»(٢).

واتە: ئێمە قورئانمان بۆ ناردوویتەتە خوارەوە بە ڕاست و دروستی، بۆئەوەی یەكلاكەرەوە بیت لەنێوان خەڵكیدا، بەو شێوەیەی كە پێی ناساندوویت و فێری كردوویت و وەحی بۆ ناردوویت.

**مەبەست لەم ئایەتەدا:** ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ﴾ واتە: بەوەی خوای پەروەردگار زانا و ئاشنا و ڕێنموونیت دەكات، كەواتە بابەتە دینییەكان ئاشنایی و سەرپەرشتی و فێركردنی تایبەتی خوای لەسەرە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، دەبێت فەرموودەش وەحی بێت لەلایەن خواوە، وە خوای پەروەردگار پێغەمبەر ﷺ ناهێڵێتەوە لەسەر هەڵە و نەپێكاندن.

---

(١) "تفسير القرطبي" (١٠/ ١٠٩) في تفسير سورة [النَّحْلِ: آيَةُ: ٤٤].

(٢) "التفسير الوسيط" للطنطاوي (٣/ ٢٩٧) في تفسير سورة [النِّسَاءِ: آيَةُ: ١٠٥].

بۆیە ئیمامی (البخاري) رحمه الله سەردێڕێکی نووسیوە بەناوی: «بَابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْأَلُ مِمَّا لَمْ يُنْزَلْ عَلَيْهِ الوَحْيُ، فَيَقُولُ: «لاَ أَدْرِي»، أَوْ لَمْ يُجِبْ حَتَّى يُنْزَلَ عَلَيْهِ الوَحْيُ، وَلَمْ يَقُلْ بِرَأْيٍ وَلاَ بِقِيَاسٍ، لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ [النساء: ١٠٥]»[١].

واتە: باسی هەر بابەتێك کە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکرایە، لەبارەیەوە وەحی بۆ نەهاتایەتە خوارەوە دەیفەرموو: نازانم، یان وەڵامی نەدەدایەوە تا وەحی بۆ دەهاتە خوارەوە، بە ڕاوبۆچوون و هاوشێوە وەڵامی نەدەدایەوە، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ بەو شێوەیەی خوا پێت فێر دەکات.

کەواتە هەموو ئەو حوکمکردن و شیکردنەوە دینییانە بە وەحی بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە پێی دەوترێت فەرموودە.

خەلیفە (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه دەفەرموێت: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ الرَّأْيَ إِنَّمَا كَانَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُصِيبًا لِأَنَّ اللهَ كَانَ يُرِيهِ، وَإِنَّمَا هُوَ مِنَّا الظَّنُّ وَالتَّكَلُّفُ»[٢].

واتە: ئەی خەڵکینە، ڕا و بۆچوونەکان لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێکاندنی حەق بوو، لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار ڕێنموونی دەکرد، بەڵام لەلای ئێمەوە گومان و زۆرەملێیە.

**ئایەتی پێنجەم:** قال الله تعالى: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥﴾ [النجم: ٣ – ٥].

قَالَ (السعدي) رحمه الله: «أي: لا يتبع إلا ما أوحى الله إليه من الهدى والتقوى، في نفسه وفي غيره، ودل هذا على أن السنة وحي من الله لرسوله صلى الله عليه وسلم، كما قال تعالى: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ وأنه معصوم فيما يخبر به عن الله تعالى وعن شرعه، لأن

(١) "صحيح البخاري" (٩/ ١٠٠).

(٢) رواه أبو داود (٣٥٨٦)، وقال شعيب الأرنؤوط: رجاله ثقات إلا أن فيه انقطاعاً، ورواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٥٨)، وفي "المدخل" (٢١٠)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢٠٠٠).

كلامه لا يصدر عن هوى، وإنما يصدر عن وحي يوحى»[١].

واتە: پێغەمبەر ﷺ شوێنکەوتەی وەحی خواییە لە خۆی و خەڵکیدا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ وەحییە لەلایەن خواوە و پارێزراوە لە گەیاندنی دینیدا، لەبەرئەوەی قسەکانی لە وەحییەوەیە.

وَقَالَ (الْقُرْطُبِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَفِيهَا أَيْضًا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ كَالْوَحْيِ الْمُنَزَّلِ فِي الْعَمَلِ»[٢].

واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فەرموودە و کارەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکوو وەحی وایە دابەزیوە لە کارەکاندا.

ئیمامی (الشِّنْقِيطِي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَقَوْلُهُ تَعَالَى فِي هَذِهِ الْآيَةِ الْكَرِيمَةِ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ اسْتَدَلَّ بِهِ عُلَمَاءُ الْأُصُولِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ يَجْتَهِدُ، وَالَّذِينَ قَالُوا إِنَّهُ قَدْ يَقَعُ مِنْهُ الِاجْتِهَادُ، اسْتَدَلُّوا بِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٣]. الْآيَةَ، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [الأنفال: ٦٧]. الْآيَةَ، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ [التوبة: ١١٣]. الْآيَةَ.

قَالُوا: فَلَوْ لَمْ يَكُنْ هَذَا عَنِ اجْتِهَادٍ، لَمَا قَالَ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ الْآيَةَ. وَلَمَا قَالَ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ﴾، وَلَا مُنَافَاةَ بَيْنَ الْآيَاتِ، لِأَنَّ قَوْلَهُ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ مَعْنَاهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يُبَلِّغُ عَنِ اللهِ إِلَّا شَيْئًا أَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ أَنْ يُبَلِّغَهُ»[٣].

واتە: ئەم ئایەتە زانایانی (أصول) دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیجتیهادی نەکردووە، وە ئەو زانایانەی کە دەڵێن ئیجتیهادی کردووە بەڵگەیان ئەو ئایەتانەیە کە باس لە ئیزندانی خەڵکی دەکات لە جیهاددا، وە گۆڕینەوەی دەسگیرکراوەکانی شەڕی بەدر و داوای لێخۆشبوونی بۆ (أبو طالب)ی مامی، کە لەمانەدا هیچی خوای گەورە پشتیوانی ناکات و

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٨١٨، في تفسير سورة [النجم: آية: ٤].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٧/ ٨٥)، في تفسير سورة [النجم: آية: ٤].

(٣) "أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن" (١٠/ ١٠٩) في تفسير سورة [النحل: آية: ٤٤].

دەفەرموێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ خوا لێت خۆش بێت بۆ ئیزندان، یاخود دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ...﴾ نەدەبوایە پێغەمبەر ... بۆ لێخۆشبوونی مامی و بەندییەكانی شەڕی بەدر.

بەڵام ئەمانە و ئەو ئایەتەی ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ﴾ پێچەوانەی یەك نین، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ هیچ ناگەیەنێت بەناوی خواوە، بێجگە لە شتێك نەبێت كە وەحی بۆ دابەزیبێت لەسەری و بیگەیەنێت، بۆیە گەیاندنی دین لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ وەحی خوایی بووە بۆی، كەواتە بەشێوەیەكی گشتی هەموو فەرموودە و كارەكان لەژێر فەرمانی وەحیدا بووە، بۆیە كاری پێغەمبەریش ﷺ لە دونیادا گەیاندنی دین بووە وەكوو خۆی، وە سوننەت سەلماندوویەتی كە ئەم قورئانە لەلایەن خواوەیە، بۆیە ناشێت شایەت و خاوەنەكەی لەم كارە دەركرێت.

## بەڵگەكانی فەرموودە لەسەر (وەحی) بوونی فەرموودە

**فەرموودەی یەكەم:** قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلَا يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلَالٍ فَأَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ»[(١)].

واتە: من قورئان و هاوشێوەی قورئانم بۆ هاتووە، ڕەنگە بەم زووانە كەسێك بێت تێر بخوات و پاڵبداتەوە بە پاڵپشتەكەیەوە و بڵێت: كار بەم قورئانە دەكەین و بەس، هەرچی حەڵاڵی تێدایە كاری پێ دەكەین، وە هەرچی حەرامەكانیشیەتی حەرامی دەكەین.

مەبەست لە وشەی «أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ» من قورئان و هاوشێوەكەیم بۆ هاتووە.

---

(١) رواه أبو داود (٤٦٠٦)، واللفظ له، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، وأحمد في "المسند" (١٧١٧٤)، والطبراني في "الكبير" (٦٧٠)، والمروزي في "السنة" (٢٤٤)، والبيهقي في "معرفة السنن والآثار" (٥٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٢)، والآجري في "الشريعة" (٩٧)، والخطيب في "الكفاية" ص٨، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢٦٤٣)، و "المشكاة" (١٦٣).

هاوشێوەکەی بێگومان هەر فەرموودەکانە بۆی هاتووە، واتە وەکوو قورئان لەلایەن خواوە بۆی هاتووە، کەواتە وەحییە.

قَالَ (ابن حزم) ﷺ: «﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾: فصح لنا بذلك أن الوحي ينقسم من الله عز وجل إلى رسوله صلى الله عليه وسلم على قسمين: أحدهما وحي متلو مؤلف تأليفا معجز النظام وهو القرآن، والثاني وحي مروي منقول غير مؤلف ولا معجز النظام ولا متلو لكنه مقروء وهو الخبر الوارد عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، وهو المبين عن الله عز وجل مراده منا»[١].

واتە: (ابن حزم) ﷺ دەڵێت: بەگوێرەی ئایەتەکە، ڕاست و دروستە کە وەحی لەلایەن خواوە دەبێتە دوو بەش: یەکێکیان وەحییەکی خوێندنەوەییە و خاوەنی داڕشتنێکی موعجیزەییە، ئەویش قورئانە، وە دووەمیان وەحییەکی گێڕانەوەیە و گوازراوەیە بۆمان، پێکهاتە نییە لە داڕشتنێکی موعجیزەیی و خاوەنی خوێندنەوەش نییە، بەڵکوو دەخوێندرێتەوە، ئەویش فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ کە ڕوونکەرەوەی فەرموودەکانی خوایە بۆ ئێمە.

قَالَ (ابن حجر) ﷺ: «وَقَدْ ذَكَرَ الشَّافِعِيُّ الْمَسْأَلَةَ فِي الْأُمِّ، وَذَكَرَ أَنَّ حُجَّةَ مَنْ قَالَ أَنَّهُ لَمْ يَسُنَّ شَيْئًا إِلَّا بِأَمْرٍ وَهُوَ عَلَى وَجْهَيْنِ، إِمَّا بِوَحْيٍ يُتْلَى عَلَى النَّاسِ، وَإِمَّا بِرِسَالَةٍ عَنِ اللهِ أَنِ افْعَلْ كَذَا»[٢].

واتە: (ابن حجر) ﷺ دەڵێت: (شافعی) ﷺ دەڵێت: وەحی دوو جۆرە، یا بە وەحییەکە بخوێندرێتەوە بەسەر خەڵکیدا، یاخود بە فەرمانێك لەلایەن خواوە کە ئەوە بکە.

وَقَالَ (الزركشي) ﷺ: «صَرَّحَ الشَّافِعِيُّ رَحِمَهُ اللهُ فِي الرِّسَالَةِ بِأَنَّ السُّنَّةَ مُنْزَلَةٌ كَالْقُرْآنِ»[٣].

واتە: (شافعی) ﷺ بە ئاشکرا دەڵێت سوننەت وەحییە وەکوو قورئان.

وَقَالَ (حَسَّان بْنُ عَطِيَّة) ﷺ: «كَانَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ يَنْزِلُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

(١) "الإحكام في أصول الأحكام" لابن حزم (١/ ٩٧).

(٢) "فتح الباري" لابن حجر (١٣/ ٢٩١).

(٣) "البحر المحيط في أصول الفقه" للزركشي (٨/ ٢٥١).

وَسَلَّمَ بِالسُّنَّةِ، كَمَا يَنْزِلُ عَلَيْهِ بِالْقُرْآنِ، وَيُعَلِّمُهُ إِيَّاهَا كَمَا يُعَلِّمُهُ الْقُرْآنَ»(١).

واته: یەکێك لە ناودارەکانی تابعین (حَسَّان بْنُ عَطِيَّة) رحمه الله دەڵێت: (جبريل) عليه السلام سوننەتی بە ڕێگەی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەناردە خوارەوە، وەکوو چۆن قورئانی دەهێنایە خوارەوە.

قَالَ (الشَّاطِبِيُّ) رحمه الله: «كُلُّ مَا أَخْبَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ خَبَرٍ فَهُوَ كَمَا أَخْبَرَ، وَهُوَ حَقٌّ وَصِدْقٌ، مُعْتَمَدٌ عَلَيْهِ فِيمَا أَخْبَرَ بِهِ وَعَنْهُ، سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَنْبَنَى عَلَيْهِ فِي التَّكْلِيفِ حُكْمٌ أَمْ لَا، كَمَا أَنَّهُ إِذَا شَرَعَ حُكْمًا أَوْ أَمَرَ أَوْ نَهَى؛ فَهُوَ كَمَا قَالَ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ، لَا يُفَرَّقُ فِي ذَلِكَ بَيْنَ مَا أَخْبَرَهُ بِهِ الْمَلَكُ عَنِ اللهِ، وَبَيْنَ مَا نُفِثَ فِي رُوعِهِ وَأُلْقِيَ فِي نَفْسِهِ، أَوْ رَآهُ رُؤْيَةَ كَشْفٍ وَاطِّلَاعٍ عَلَى مُغَيَّبٍ عَلَى وَجْهٍ خَارِقٍ لِلْعَادَةِ، أَوْ كَيْفَ مَا كَانَ؛ فَذَلِكَ مُعْتَبَرٌ يُحْتَجُّ بِهِ وَيُبْنَى عَلَيْهِ فِي الِاعْتِقَادَاتِ وَالْأَعْمَالِ جَمِيعًا؛ لِأَنَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُؤَيَّدٌ بِالْعِصْمَةِ، وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى ... فَكُلُّ مَا حَكَمَ بِهِ أَوْ أَخْبَرَ عَنْهُ مِنْ جِهَةِ رُؤْيَا نَوْمٍ أَوْ رُؤْيَةِ كَشْفٍ مِثْلِ مَا حَكَمَ بِهِ مِمَّا أَلْقَى إِلَيْهِ الْمَلَكُ عَنِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»(٢).

واته: هەرچی هەواڵی پێغەمبەرە ﷺ وەکوو خۆیەتی، حەق و ڕاستە و پشتی پێ دەبەسترێت، جا ئەگەر یاسایەکی لەسەر دابڕێژرێن یان نا، وە گەر فەرمانێك بێت یان ڕێگرییەك، ئەوا بەو شێوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، جیاوازی نییە لەنێوان هەواڵدانی (ملائکة)یەك لەسەری لەلایەن خواوە جل جلاله، یان خستنە دڵەوە، یاخود بیستنێك بەشێوەی ئاگادارکردنەوەیەك لەلایەن غەیبەوە، یاخود بە هەر شێوەیەك بێت کە لەلایەن خواوە جل جلاله ئاگادار کرابێتەوە، ئەوا ڕەچاو دەکرێت و بەڵگەیە و یاسای لەسەر دادەڕێژرێت، گەر لە بواری بیروباوەڕدا بێت، یاخود کارەکان بە گشتی، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ پشتیوانی کراوە بە پاراستنی تایبەتی خوایی

(١) رواه الدارمي في "السنن" (٦٠٨)، وفي "المراسيل" (٥٣٦)، والمروزي في "السنة" (١٠٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٩٠)، والخطيب في "الكفاية" ص١٢، وفي "الفقيه والمتفقه" (١/ ٢٦٦)، وابن عبد البر في "الجامع" (١/ ١٩١)، والهروي في "ذم الكلام" (٢١٦)، وفي "فتح الباري" لابن حجر (١٣/ ٢٩١)، و "مفتاح الجنة" للسيوطي ص١٦، و "تدوين السنة النبوية" لمحمد آل مطر الزهراني ص٢١، وصححه الألباني في كتاب "الإيمان" لابن تيمية ص٣٧ ، فقال: رواه الدارمي بسند صحيح عن حسان بن عطية، فهو مرسل.

(٢) "الموافقات" للشاطبي (٤/ ٤٦٤، ٤٧٠).

(معصومية) و قسەیەك لە ویست و ئارەزووەوە ناكات ... هەرچی حوكم و هەواڵ هەیە لە لایەنییەوە گەر بە ڕێگەی خەو بێت یاخود ئاگاداركردنەوە، وەكوو ئەو وەحییە وایە كە (ملائكة) لەلایەن خواوە بەتایبەت هەواڵی بۆ دەهێنێت.

قَالَ (ابْنُ الْقَيِّمْ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَلَا فَرْقَ بَيْنَ مَا يُبَلِّغُهُ عَنْهُ مِنْ كَلَامِهِ الْمَتْلُوِّ وَمِنْ وَحْيِهِ الَّذِي هُوَ نَظِيرُ كَلَامِهِ فِي وُجُوبِ الِاتِّبَاعِ، وَمُخَالَفَةِ هَذَا كَمُخَالَفَةِ هَذَا»[1].

واتە: جیاوازی نییە لەنێوان وەحییەك كە دەخوێندرێتەوە وەكوو (قورئان) و وەحییەكیش كە ناخوێندرێتەوە وەكوو فەرموودە لە شوێنكەوتەییدا، وە پێچەوانەییەتی ئەو وەكوو ئەو وایە.

**فەرموودەی دووەم:** لە باسی (قصة العسيف)دا كە كرێكارێك زینای لەگەڵ ژنی خاوەن ماڵەكەدا كردبوو، چوونە لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: «لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، ... وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ، ... عَلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَارْجُمْهَا»[2].

واتە: بە كتێبی خوا حوكم لەنێوانتاندا دەكەم، كوڕی ئەم دەبێت سەد جەڵدی لێ بدرێت و ساڵێك دوور بخرێتەوە، لەسەر ئافرەتەكەش ڕەجمكردنە.

ئەمە لە كاتێكدایە كە لە قورئاندا دووركەوتنەوەی ساڵ و ڕەجمكردنی تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمووی بە كتێبی خوا لە نێوانتاندا حوكم دەكەم، كەواتە فەرموودە وەحییە بێجگە لە وەحی قورئان.

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (٢/ ٢٢٤).

(٢) رواه البخاري (٢٦٩٥)، ومسلم (١٦٩٧)، وأبو داود (٤٤٤٥)، والترمذي (١٤٣٣)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٣١)، وفي "الصغرى" (٥٤١٠)، وابن ماجه (٢٥٤٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٤٣٧)، ومالك في "الموطأ" (١٧٦٠)، وأحمد في "المسند" (١٧٠٣٨)، والدارمي في "سننه" (٢٣٦٣)، والبزار في "المسند" (٣٧٧٠)، والطبراني في "الكبير" (٥١٨٨)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٣٣٠٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٨٧٨٥)، والطيالسي في "مسنده" (١٤٣٠)، والمروزي في "السنة" (٣٤٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٩٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٦٩١٧)، وفي "الصغير" (٢٥٤٥)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١١١٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٥٧٩).

**فەرموودەی سێیەم:** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: «كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ حِفْظَهُ، فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ، وَالرِّضَا، فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَى فِيهِ، فَقَالَ: "اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلَّا حَقٌّ"»[(١)].

واتە: (عبداللە ی کوڕی عەمر) ﷺ دەڵێت: من هەرشتێکم لە پێغەمبەرەوە ﷺ ببیستایە دەمنووسی، دەمویست لەبەری بکەم، قورەیش ڕێگری لێ دەکردم، وتیان: هەموو شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەنووسیت، ئەو ئادەمیزادە قسە دەکات لەکاتی تووڕەبوون و ڕازیبووندا، منیش نووسینم واز لێهێنا و بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەنجەی ئاماژەی بۆ دەمی کرد و فەرمووی: بنووسە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ شتێك لێوەی نایەتە دەرەوە جگە لە حەق نەبێت.

پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوات کە هەموو قسەکانی حەقە، تەنانەت لەکاتی تووڕەبوونیشدا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وەحییە لەلایەن خواوە ﷻ، وە چاودێری تەواوی خوایی لەسەرە.

**فەرموودەی چوارەم:** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّتِي»[(٢)].

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو شتتان لەدوای خۆم بۆ بەجێدەهێڵم، گەر پەیوەست بن پێوەی گومڕا نابن، ئەوانیش قورئان و سوننەتەکانی منن.

پێغەمبەر ﷺ سوننەتی خستووەتە پاڵ قورئان و هەمان وادەی گومڕانەبوونی لەگەڵدا پێدراوە، کەواتە دەبێت شێوازی داڕشتنی فەرموودەکان لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بەڵگە بێت لەسەر بەوەحیبوونی، وەکوو ئەم شێوازانە:

---

(١) رواه أبو داود (٣٦٤٦)، وأحمد في "المسند" (٦٨٠٢)، وسبق تخريجه ص٣٨.

(٢) رواه الدارقطني في "السنن" (٤٦٠٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣١٩) واللفظ له، وسبق تخريجه ص٣١.

أ. هەرچییەك كە بە وشەی وەحی (الوحي) هاتبێت:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... وَإِنَّهُ قَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي القُبُورِ، مِثْلَ - أَوْ قَرِيبَ مِنْ - فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ»[١].

واتە: خوای گەورە وەحی بۆ ناردووم كە ئێوە تووشی ناڕەحەتییەكی ناو گۆڕ دەبن، وەكوو فیتنەی (مسيح الدجال).

ئەمە بە وەحی فەرموودەیی هەواڵمان پێدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە وەحی قورئانی باسی ناڕەحەتییەكانی ناو گۆڕی تێدا نییە.

٢. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... وَإِنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلَا يَبْغِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ»[٢].

واتە: خوای گەورە ﷻ وەحی بۆ ناردووم كە پێتانی ڕابگەیەنم خۆبەكەمزان بن، تاوەكوو كەس خۆی بە گەورە نەزانێت بەسەر كەسدا، وە بەو هۆكارەوە هەندێكتان ستەم لە هەندێكتان بكەن.

ئەمە وەحییەكی تایبەتە بۆ پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە جۆری وەحی قورئان، كەواتە فەرموودەش بە شێوەی گشتی لە بابەتە دینییەكاندا وەحییە.

٣. عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، كَانَ يَقُولُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: لَيْتَنِي أَرَى نَبِيَّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْجِعْرَانَةِ، وَعَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَوْبٌ قَدْ أُظِلَّ بِهِ عَلَيْهِ، مَعَهُ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فِيهِمْ عُمَرُ، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ عَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ، مُتَضَمِّخٌ بِطِيبٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ فِي جُبَّةٍ بَعْدَمَا

---

(١) رواه البخاري (٩٢٢)، ومسلم (٩٠٥)، والنسائي في "الكبرى" (٢٢٠٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٣١١٤)، ومالك في "الموطأ" (٦٠٤)، وأحمد في "المسند" (٢٦٩٢٥)، والطبراني في "الكبير" (٣١٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٢٠٣٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٦٣٦٠)، وفي "الشعب" (١/ ٦١٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٣٧).

(٢) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٤٢٨)، ومسلم (٢٨٦٥)، وأبو داود (٤٨٩٥)، وابن ماجه (٤١٧٩)، والبزار في "المسند" (٣٤٩٥)، والطبراني في "الكبير" (١٠٠٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢١٠٨٣)، وفي "الشعب" (٦٢٤٥)، وإسحاق بن راهويه في "مسنده" (٤٠٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ١٧)، وابن عبد البر في "الجامع" (٩٥٠).




تَضَمَّخَ بِطِيبٍ؟ فَنَظَرَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاعَةً، ثُمَّ سَكَتَ، فَجَاءَهُ الْوَحْيُ، فَأَشَارَ عُمَرُ بِيَدِهِ إِلَى يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ: تَعَالَ، فَجَاءَ يَعْلَى، فَأَدْخَلَ رَأْسَهُ، فَإِذَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْمَرُّ الْوَجْهِ، يَغِطُّ سَاعَةً، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ: «أَيْنَ الَّذِي سَأَلَنِي عَنِ الْعُمْرَةِ آنِفًا؟» فَالْتُمِسَ الرَّجُلُ، فَجِيءَ بِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**أَمَّا الطِّيبُ الَّذِي بِكَ، فَاغْسِلْهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَأَمَّا الْجُبَّةُ فَانْزِعْهَا، ثُمَّ اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ، مَا تَصْنَعُ فِي حَجِّكَ**»[(١)].

واتە: ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (يعلى بن أمية)یە دەڵێت: بە (عمر بن الخطاب)م رضي الله عنه وت: پێغەمبەرم پشان بدە کاتێك وەحی بۆ دێت، دەڵێت: ئێمە دەچووین بۆ عومرەکردن، پیاوێك هات وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ، گەر پیاوێك ئیحرامی لەبەر کردبێت بۆ عومرە و بۆنی خۆشی بەرکەوتبێت چی بکات؟ پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان وەحی بۆ هات، ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه بانگی (يعلى)ی رضي الله عنه کرد، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ سەری بە پارچە قوماشێك داپۆشیبوو، (يعلى) سەری بردە ژێر پارچە قوماشەکەوە، بینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەموچاوی سوور بووەتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە سەر خۆی و فەرمووی: کوا ئەو کەسەی کە پرسیاری لە عومرە کرد؟ پیاوەکە هات و فەرمووی: سێ جار ئەو بۆنە بشۆ کە بە ئیحرامەکەوەیە، وە ئەو جبەیەش داکەنە لەبەرتا و عومرەکەت تەواو بکە وەکوو چۆن لە حەجدا تەواوی دەکەیت.

خۆ ئەم حوکمەش (جل و بەرگی ئیحرام) وەحی بووە و لە قورئانیشدا نییە، وە بە فەرموودە و سوننەتیش هەژمار دەکرێت.

**٤.** عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: «**مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ كَثْرَةِ ذِكْرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهَا، وَلَقَدْ أَمَرَهُ رَبُّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ وَلَا نَصَبَ**»[(٢)].

---

(١) رواه البخاري (١٥٣٦)، ومسلم (١١٨٠)، وأحمد في "المسند" (١٧٩٤٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٣٣١).

(٢) رواه البخاري (٣٨١٦)، ومسلم (٢٤٣٥)، والترمذي (٣٨٧٦)، والنسائي في "الكبرى" (٨٣٠٣)، وابن ماجه (١٩٩٧)، وأحمد في "المسند" (٢٥٦٥٨)، وفي "فضائل الصحابة" (١٥٨٩)، والطبراني في "الكبير" (١٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٤٧٩٧)، والآجري في "الشريعة" (١٦٨٢)، وفي "جزء الألف دينار" للقطيعي (١٧)، واللفظ له.

واتە: (عائیشە) ﵂ دەڵێت: ئەوەندەی غیرەم بەرامبەر (خەدیجە) ﵂ هەبووە لە خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ بۆ کەسیان نەمبووە، لەبەر زۆر باسکردن و وەسفکردنی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، لەگەڵ ئەوەشدا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە موژدەی ماڵێکی لە بەهەشت پێبدات کە هیچ ناخۆشی و نارەحەتی تێدا نەبێت.

ب. هەرچییەك كە بە شێوەی فەرمان (الأمر) هاتبێت:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ، ...»(١).

واتە: فەرمانم پێ کراوە شەڕ بکەم لەگەڵ خەڵکی، تا دەڵێن (لا إله إلا الله)، گەر وتیان ئەوا ماڵ و خوێنیان پارێزراوە.

یاخود نامەکەی (أبو بکر الصدیق) ﵁ لە زەکاتدا کە وتی: «وَالَّتِي أَمَرَ اللهُ بِهَا رَسُولَهُ، ...»(٢).

واتە: ئەو ڕێژانەیە کە خوا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕێژانە لە قورئاندا نییە.

٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ،

---

(١) رواه البخاري (٧٢٨٤)، ومسلم (٢٠)، وأبو داود (١٥٥٦)، والترمذي (٢٦٠٦)، والنسائي في "الكبرى" (٢٢٣٥)، وابن ماجه (٣٩٢٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٢١٦)، وأحمد في "المسند" (٦٧)، والدارقطني في "السنن" (١٨٨٤)، والبزار في "المسند" (٢١٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٨)، والطبراني في "الكبير" (١٧٤٦)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٨٧١٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٨٩٣٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٨٥١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧٣٢٤)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٥٤٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٠٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٥٦٧).

(٢) رواه البخاري (١٤٥٤)، وأبو داود (١٥٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (٢٢٣٩)، وابن ماجه (١٨٠٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٢٦١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٢٦٦)، وأحمد في "المسند" (٧٢)، والدارقطني في "السنن" (١٩٨٤)، والحاكم في "المستدرك" (١٤٤١)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٢٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧٢٤٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٦/ ٤).

وَلَا أَكُفَّ ثَوْبًا وَلَا شَعْرًا»[(١)].

واته: فەرمانم پێ كراوه كه سوجده لەسەر حەوت پارچه ئێسك بەرم، وه جل و قژ كۆنەكەمەوه (كۆكردنەوەی جل و قژ بۆئەوەی نەكەوێتە سەر زەوی لەكاتی سوجدەدا، ئەمە كارێكی ڕێگەپێنەدراوه).

٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَقَدْ أُمِرْتُ بِالسِّوَاكِ حَتَّى خِفْتُ عَلَى أَسْنَانِي»[(٢)].

واته: فەرمانم پێ كراوه بە سیواككردن، تاوەكوو ترسام لە كەوتنی ددانەكانم.

٤. عَنْ عَلِيٍّ، رَضِيَ اللهُّ عَنْهُ، قَالَ: لَمَّا وُلِدَ الْحَسَنُ سَمَّاهُ حَمْزَةَ، فَلَمَّا وُلِدَ الْحُسَيْنُ سَمَّاهُ بِعَمِّهِ جَعْفَرٍ، قَالَ: فَدَعَانِي رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: «إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أُغَيِّرَ اسْمَ هَذَيْنِ»، فَقُلْتُ: اللهُّ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ فَسَمَّاهُمَا حَسَنًا وَحُسَيْنًا[(٣)].

واته: (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) ﷺ دەڵێت: كاتێك (حسن) لەدایك بوو ناوم نا (حمزة)، وه (حسين)یش لەدایك بوو ناوم نا (جعفر)، پێغەمبەر ﷺ بانگی كردم و فەرمووی: من فەرمانم پێ كراوه كه ناوی ئەم دوانە بگۆڕم، منیش وتم: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترن، ناویانی نا (حسن وحسين).

٥. عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُّ عَنْهُ، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَادِي العَقِيقِ يَقُولُ:

---

(١) رواه البخاري (٨١٢)، ومسلم (٤٩٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٦٣٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٩٢٤)، وأحمد في "المسند" (٢٥٢٧)، والدارمي في "سننه" (١٣٥٨)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٤٦٤)، والطبراني في "الكبير" (١٠٨٦٢)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٩٧٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٨٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٦٤٦).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (١٢٢٨٦)، وفي "الأوسط" (٦٩٦٠)، والضياء في "المختارة" (٣١١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٥١١٩).

(٣) رواه أحمد في "المسند" (١٣٧٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، وكذا قاله أحمد شاكر، وفي "فضائل الصحابة" برقم (١٢١٩)، ورواه الحاكم في "المستدرك" (٧٧٣٤)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والبزار في "المسند" (٦٥٧)، والضياء في "المختارة" (٧٣٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٧٠٩).

«أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي، فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الوَادِي الْمُبَارَكِ، وَقُلْ: عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ »[(١)]، وفي رواية: «أَتَانِي جَبْرَائِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ وَأَنَا بِالْعَقِيقِ ...»[(٢)].

**واته: لەلای خواوه نێردراوێك هات، فەرمانی دا كه لەم شوێنەدا نوێژ بكەم (ئەو شوێنەش "ميقات ذا الحليفة" يه كاتێك دەچوون بۆ حەج.**

## ج. هەرچییەك كه بەناوی (وعد)ەوه هاتبێت:

**١. كاتێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر كوژراوەكانی شەڕی بەدر وەستا و وتی:** «يَا فُلَانَ بْنَ فُلَانٍ وَيَا فُلَانَ بْنَ فُلَانٍ هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ حَقًّا؟ فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي اللهُ حَقًّا»[(٣)].

**واته: ئەی فلانی كوڕی فلان، ئەی فلانی كوڕی فلان، ئایا گەیشتن بەو وادەیەی كه خوا و پێغەمبەرەكەی پێیدان به حەق؟ من گەیشتم بەو وادەیەی كه خوا پێی داوم.**

**٢.** قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَلَقَدْ وَعَدَنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا، بِغَيْرِ حِسَابٍ»[(٤)].

**واته: خوای گەوره وادەی ئەوەی پێداوم كه حەفتا هەزار كەس لە ئوممەتەكەم بچنه بەهەشتەوه بەبێ لێپرسینەوه.**

---

(١) رواه البخاري (١٥٣٤)، وأبو داود (١٨٠٠)، وابن ماجه (٢٩٧٦)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٦١٧)، وأحمد في "المسند" (١٦١)، والبزار في "المسند" (٢٠١)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (١/ ١٤٦)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٣٦٨٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٨٤٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٨٨٣).

(٢) رواه البيهقي في "السنن الكبرى" (٨٨٤٧).

(٣) رواه البخاري (٣٩٧٦)، ومسلم (٢٨٧٣)، والنسائي في "الكبرى" (٢٢١٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٧٨)، وأحمد في "المسند" (١٨٢)، والبزار في "المسند" (٦٥٥٩)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٤٠)، والطبراني في "الكبير" (٤٧٠١)، وفي "الصغير" (١٠٨٥)، و "الأوسط" (٨٤٥٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٧٠٩)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٣٥٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٨٧٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣/ ٣٨٤).

(٤) رواه ابن ماجه (٤٢٨٥)، والطبراني في "الكبير" (٤٥٥٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣١٧٤١)، والطيالسي في "مسنده" (١٣٨٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٨٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٢٨٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٤٠٥)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٠٦٢).

د. هەرچییەك كە بە وشەی خستنە دڵەوە هاتبێت:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَلْقَى فِي رُوعِي أَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَنْ يَخْرُجَ مِنَ الدُّنْيَا حَتَّى يَسْتَكْمِلَ رِزْقَهُ»(١).

واتە: (جبريل) عليه السلام خستییە دڵمەوە كە هیچ نەفسێك نامرێت تاوەكوو ڕزقەكەی تەواو نەكات.

٢. ... قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَتُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «نَعَمْ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ، مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ، إِلَّا الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَالَ لِي ذَلِكَ»(٢).

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ، گەر بكوژرێم لەپێناوی خوادا تاوانەكانم دەسڕدرێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، گەر ئارام بگریت، پشت هەڵ نەكەیت، بێجگە لە قەرز نەبێت، (جبريل) عليه السلام ئەوەی پێ وتم.

هـ. هەرچییەك كە بە وشەی (أعطيت) واتە پێبەخشین هاتبێت:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الغَنَائِمُ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ»(٣).

---

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (٢١٣٦)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص١٧٣، وفي "القضاء والقدر" (٢٣٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (١٧٠٠).

(٢) رواه مسلم (١٨٨٥)، والترمذي (١٧١٢)، والنسائي في "الكبرى" (٤٣٥٠)، وأحمد في "المسند" (٨٣٧١)، والبيهقي في "الشعب" (٥١٤٦).

(٣) رواه البخاري (٤٣٨)، ومسلم (٥٢١)، والنسائي في "الصغرى" (٤٣٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٣٩٨)، وأحمد في "المسند" (٢٧٤٢)، والدارمي في "سننه" (١٤٢٩)، والبزار في "المسند" (٤٠٧٧)، والطبراني في "الكبير" (١١٠٨٥)، =

واته: پێنج شتم پێدراوه كه به پێغەمبەرانی پێش خۆم نەدراوه ... .

٢. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ خَزَائِنَ مَفَاتِيحِ الأَرْضِ»[١].

واته: كلیلی خەزێنەكانی سەر زەویم پێدراوه.

و. هەرچییەك كه به وشەی (إذن) واته ڕێگەپێدان هاتبێت:

١. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... إِنَّ اللهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ، وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ، ...»[٢].

واته: شەڕكردن لە مەككە حەرامه، بەڵام خوای گەورە ئیزنی به پێغەمبەرەكەی داوه و به ئێوەی نەداوه.

٢. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْغَبُونَ عَمَّا رُخِّصَ لِي فِيهِ، فَوَاللهِ لَأَنَا أَعْلَمُهُمْ بِاللهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً»[٣].

واته: خەڵكانێك خۆیان دەپاراست لە هەندێ شت كه پێغەمبەر ﷺ دەیكرد، ئەویش كه ئەمەی پێگەیشتەوه فەرمووی: ئەو خەڵكانه چییانه وا خۆیان دەپارێزن لە شتانێك كه خوا ڕێگەی پێداوم؟! سوێند به خوا من لە هەموویان زاناتر و لەخواترسترم بۆی.

٣. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لِأُمِّي فَلَمْ يَأْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُهُ أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي»[٤].

---

= وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣١٦٤٢)، والطيالسي في "مسنده" (٤٧٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٠٢٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٤٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣١٦).

(١) رواه البخاري (٣٥٩٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٦٨٠٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٢٣).

(٢) رواه البخاري (١٠٤)، ومسلم (١٣٥٤)، والترمذي (٨٠٩)، والنسائي في "الكبرى" (٣٨٤٥)، وفي "الصغرى" (٢٨٧٦)، وأحمد في "المسند" (١٦٣٧٣)، والطبراني في "الكبير" (٤٨٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٣٧٤)، والفاكهي في "أخبار مكة" (١٤٩٣).

(٣) رواه مسلم (٢٣٥٦)، والنسائي في "السنن الكبرى" (٩٩٩٢)، وفي "عمل اليوم والليلة" (٢٣٤)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٠١٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٥٤١٤).

(٤) رواه مسلم (٩٧٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦١٩٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٤٠٧٩).

واتە: داوای ئیزنم كرد لە خوای گەورە كە داوای لێخۆشبوون بۆ دایكم بكەم، ڕێگەی پێ نەدام، وە داوام كرد كە سەردانی گۆڕەكەی بكەم، ڕێگەی پێدام.

ز. هەرچییەك كە بە وشەی (النهي) واتە ڕێگریكردن هاتبێت:

* قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا»(١).

واتە: من ڕێگریم لێكراوە قورئان لە ڕكوع و سجووددا بخوێنم.

- یاخود بە شێوەی (الرؤيا) خەوبینین:

* قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ...»(٢).

واتە: شەوی قەدرم پێ پشان دراوە لە خەودا.

- یاخود بە وشەی (الرؤية):

* قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلَّا قَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا، حَتَّى الْجَنَّةَ وَالنَّارَ»(٣).

---

(١) رواه مسلم (٤٧٩)، وأبو داود (٨٧٦)، والنسائي في "الكبرى" (٦٣٧)، وفي "الصغرى" (١٠٤٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٥٤٨)، وابن حبان في "صحيحه" (١٨٩٦)، وأحمد في "المسند" (١٩٠٠)، والدارمي في "سننه" (١٣٦٤)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٣٨٧)، والطبراني في "الدعاء" (٦٠٩)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٨٣٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٨٠٥٩)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (١٤٠٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٥٦٧)، وفي "معرفة السنن والآثار" (٣٣٨٢).

(٢) رواه البخاري (٢٠١٦)، ومسلم (١١٦٦)، واللفظ له، والنسائي في "الكبرى" (٣٣٧٨)، وابن ماجه (١٧٦٦)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢١٩٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٦٧٨)، وأحمد في "المسند" (١١٥٨٠)، والدارمي في "سننه" (١٨٢٣)، والطبراني في "الكبير" (١٩٦٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٩٥٣٩)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٤٦٣٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٥٢٨).

(٣) رواه البخاري (٩٢٢)، ومسلم (٩٠٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٣١١٤)، وأحمد في "المسند" (٢٦٩٢٥)، والطبراني في "الكبير" (٣١٦)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٥١٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٦٣٦٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٢٦٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٣٧).

**واته: لەدوای نوێژی ڕۆژگیران پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەم شوێنەدا ئەوەی نەمبینیبوو پێم پشاندرا، تەنانەت بەهەشت و دۆزەخیش.**

- یاخود بە وشەی (التخيير) واتە هەڵبژاردن:

قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «عَبْدٌ خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ زَهْرَةَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَهُ»(١).

**واته: بەندەیەك خوای گەورە هەڵبژاردنی خستە بەردەمی، لەنێوان دونیا و پاداشتی خوای گەورە خۆی، ئەویش پاداشتی لای خوای هەڵبژارد.**

**ئەم شێوازانە، وە شێوازی تریش نیشانەی وەحی خواییە بۆ شتەکان و پێغەمبەریش ﷺ بە فەرموودە گەیاندوویەتی، کەواتە فەرموودە وەحییە.**



---

(١) رواه البخاري (٣٩٠٤)، ومسلم (٢٣٨٢)، والترمذي (٣٦٦٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٨٦١)، ومالك في "الموطأ" (٦٠٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٢١).

## هەواڵە غەیبییەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر (وەحی) بوونی

یەکێکی تر لە بەڵگە بەهێزەکان لەسەر ئەوەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە گشتی وەحییە لەلایەن خواوە ﷻ، هەواڵە فەرموودەییەکانی پێغەمبەرە ﷺ لەسەر ئەو بابەتانەی کە هێشتا ڕووی نەداوە، واتە هەواڵدانی بابەتێك پێش ڕوودانی.

**گومان نییە کە هەواڵە غەیبییەکان تەنها خوای گەورە ﷻ دەیانزانێت، وەکوو دەفەرموێت:**

📖 ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ [الأنعام: ٥٩].

📖 ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ [الأنعام: ٥٠].

📖 ﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ﴾ [الأعراف: ١٨٨].

📖 ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ [النمل: ٦٥].

ئەم ئایەتانە هەمووی واتای ئەوەن کە زانستە غەیبییەکان تەنها خوای پەروەردگار دەیانزانێت.

**بەڵام هەر خۆشی ڕێگەی داوە بەوەی کە پێغەمبەرانیش ﷺ ئاگادار بکرێنەوە بەسەر هەندێك شت وەکوو موعجیزە و بەڵگەی پێغەمبەرایەتی، وەکوو دەفەرموێت:**

📖 ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ﴾ [آل عمران: ٤٤].

📖 ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ [آل عمران: ١٧٩].

📖 ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ﴾ [الجن: ٢٦، ٢٧].

ئەم ئایەتانە بە واتای ئەوە دێن کەوا هەواڵە غەیبییەکان خوای گەورە ﷻ ئاگاداری پێغەمبەرانی دەکاتەوە بە ویستی خۆی بۆ هەر پێغەمبەرێك، وە هەواڵەکانیش بە ڕێگەی فەرموودە گەیشتووە، کەواتە وەحییە لەلایەن خواوە ﷻ.

**بە نموونەی ئەمانە:**

**١. هەواڵدان بە گرتنی شاری (القسطنطينية - استانبول):**

* ... فَسُئِلَ أَيُّ الْمَدِينَتَيْنِ تُفْتَحُ أَوَّلًا قُسْطَنْطِينِيَّةُ أَوْ رُومِيَّةُ؟ ... فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَدِينَةُ هِرَقْلَ تُفْتَحُ أَوَّلًا»(١).

قَالَ الشَّيْخ (الألباني) رَحِمَهُ اللهُ: «وقد تحقق الفتح الأول على يد محمد الفاتح العثماني، كما هو معروف، وذلك بعد أكثر من ثمانمائة سنة من إخبار النبي صلى الله عليه وسلم بالفتح»(٢).

واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا: کام شار سەرەتا فەتح دەکرێت لەسەر دەستی موسوڵمانان؟ فەرمووی: شارەکەی (هیرەقل)، واتە (الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ)، ئەمەش لەدوای هەشت سەد ساڵ هاتە دی لەسەر دەستی (محمد الفاتح)دا.

**٢. هەواڵدان بە سواربوونی بەلەم و پاپۆڕ لەپێناوی خوادا:**

* عَنْ أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الْأَسِرَّةِ**»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا ... فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ(٣).

واتە: (أم حرام) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە خەودا پێم نیشان درا خەڵکانێك لە ئوممەتەکەم کە لە پێناوی خوا دەچوون بۆ جیهاد، بەسەر دەریادا دەڕۆن وەکوو پاشاکان چۆن لەسەر کورسی و تەختەکانی خۆیان بوون، (أم حرام) دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووعام بۆ بکە من یەکێك بم لەوانە، دووعای بۆ کردم، لە سەردەمی (معاوية) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ئەمە ڕوویدا،

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٦٦٤٥)، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، وسبق تخريجه ص٢٥٥.

(٢) "سلسلة الأحاديث الصحيحة" للألباني (١/ ٣٣) تحت حديث رقم (٤).

(٣) رواه البخاري (٢٧٨٨)، ومسلم (١٩١٢)، والترمذي (١٦٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (٤٣٦٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٦٦٧)، ومالك في "الموطأ" (١٦٨٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٥٣٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٧٧٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٦١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٧٣٠).

بە کەشتی جیهادیان لەپێناوی خوادا دەکرد بۆ (قبرص)، (أم حرام)یشیان لەگەڵدا بوو، کاتێك لەناو دەریا هاتنە دەرەوە سواری وڵاخەکەی بوو، پێی هەڵکەوت و وەفاتی کرد، وە گۆڕەکەشی هەر لەوێیە.

**٣. هەواڵدان بە دووبەرەکایەتی و جیاوازی نێوان موسوڵمانان:**

* قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**تَمْرُقُ مَارِقَةٌ عِنْدَ فُرْقَةٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، يَقْتُلُهَا أَوْلَى الطَّائِفَتَيْنِ بِالْحَقِّ**»، وفي رواية: «**أَقْرَبُ الطَّائِفَتَيْنِ مِنَ الْحَقِّ**»، وفي رواية: «**أَدْنَى الطَّائِفَتَيْنِ مِنَ الْحَقِّ**»[١].

واتە: لەکاتی جیاوازی نێوان موسوڵمانان، تاقمێك دەردەچێت، کەسانێکن شەڕیان لەگەڵ دەکەن کە نزیکترین کۆمەڵن لە حەقەوە.

* وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... **وَإِنَّ أُمَّتِي سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، كُلُّهَا فِي النَّارِ، إِلَّا وَاحِدَةً وَهِيَ: الْجَمَاعَةُ**»[٢].

واتە: ئەم گەلەم دەبن بە حەفتا و سێ تاقمەوە، هەموویان لە ئاگردان بێجگە لە تاقمێکیان نەبێت، ئەویش کۆمەڵی موسوڵمانانن کە لەسەر ڕێرەوی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیانن.

**٤. هاتنی کەسانێك کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکەن:**

* قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ،**

---

(١) رواه مسلم (١٠٦٤)، وأبو داود (٤٦٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (٨٤٥٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٣٥)، وأحمد في "المسند" (١١١٩٦)، والطبراني في "الأوسط" (٧٦٥٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٠٧٤)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٧٥، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٣٢٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٩٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٥٥٥).

(٢) رواه أبو داود (٤٥٩٧)، وابن ماجه (٣٩٩٣)، واللفظ له، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وأحمد في "المسند" (١٦٩٣٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٣)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٥)، والمروزي في "السنة" (٥١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٦٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٥٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٥٢)، والضياء في "المختارة" (٢٥٠٠).

قَرِيبًا مِنْ ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللهِ»[(١)].

واته: ڕۆژی دوایی نایەت تاوەکوو نزیکەی سی کەس نەیەن لەوانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن.

بۆیە هەر لە «مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّاب، وَالْأَسْوَدُ الْعَنْسِيُّ، وطُلَيْحَةُ بْنُ خُوَيْلِدٍ، وَسَجَاحُ التَّمِيمِيَّةُ، وَالْمُخْتَارَ بْنَ أَبِي عُبَيْدٍ الثَّقَفِيَّ، وَالْحَارِثُ الْكَذَّابُ»[(٢)] ... هەتا دوایی، بانگەوازی پێغەمبەرایەتییان دەکرد.

* قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَنَّ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابًا وَمُبِيرًا»[(٣)].

واته: لە هۆزی (ثقيف) درۆزنێك و خوێنڕێژێك دەبێت، ئەوەبوو درۆزنەکە (مختار بن أبي عبيد) بوو، وە خوێنڕێژەکە (حجاج بن يوسف الثقفي) بوو.

وەکوو (أسماء بن أبي بكر) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ، وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلَا إِخَالُكَ إِلَّا إِيَّاهُ»[(٤)].

واته: درۆزنەکەمان بینی کە (موختار) بوو، وە گومانت نەبێت کە خوێنڕێژەکە هەر (حەجاج)ە.

**٥. هەواڵدان بە شەهیدبوونی ئەمیرەکانی شەڕی تەبووك پێش ئەوەی هەواڵەکە بگاتە مەدینە:**

* عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، «نَعَى زَيْدًا، وَجَعْفَرًا، وَابْنَ رَوَاحَةَ

---

(١) رواه البخاري (٣٦٠٩)، وابن ماجه (٣٩٥٢)، وأحمد في "المسند" (٨١٣٧)، والبزار في "المسند" (٨٨٨٩)، وابن وضاح في "البدع" (٢٥٣).

(٢) "فتح الباري" لابن حجر (٦/ ٦١٧).

(٣) رواه مسلم (٢٥٤٥)، وأحمد في "المسند" (٥٦٠٧)، والحاكم في "المستدرك" (٦٣٤٢)، والطبراني في "الكبير" (٢٧٦)، والطيالسي في "مسنده" (١٧٤٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٥٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٧٢٧).

(٤) رواه مسلم (٢٥٤٥)، وأحمد في "المسند" (٥٦٠٧)، والحاكم في "المستدرك" (٦٣٤٢)، والطبراني في "الكبير" (٢٧٦)، والطيالسي في "مسنده" (١٧٤٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٥٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٧٢٧).

لِلنَّاسِ، قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَهُمْ خَبَرُهُمْ»(١).

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی شەهیدبوونی (زەید و جەعفەر و عبد الله ی کوڕی ڕەواحە)ی دا، پێش ئەوەی هەواڵەکە بگاتە مەدینە.**

**٦. ئاشکراکردنی نامەکەی (حاطب بن أبي بلتعة) بۆ قوڕەیش:**

* عَنْ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَالزُّبَيْرَ، وَالمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ، قَالَ: «**انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً، وَمَعَهَا كِتَابٌ فَخُذُوهُ مِنْهَا**»، فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى الرَّوْضَةِ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ، فَقُلْنَا أَخْرِجِي الكِتَابَ، فَقَالَتْ: مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ، فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى أُنَاسٍ مِنَ المُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ(٢).

**واتە: ئیمامی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ (من و زوبەیر و میقداد)ی نارد و فەرمووی: بگەنە لای باخی (خاخ)، پیرەژنێك نامەیەکی پێیە لێی وەرگرن، دەڵێت: گەیشتینە لای باخەکە و پیرەژنێکمان پێگەیشت، نامەکەمان لێسەند و هێنامانەوە، سەیرمان کرد نامەی (حاطب)ە تیایدا هەندێك کاری پێغەمبەری ﷺ درکاندووە بۆ قوڕەیش.**

**- وە هەواڵدانی کوژرانی (کیسرا) بە نوێنەرەکەیان:**

* فَلَمَّا أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُمَا: «**إِنَّ رَبِّي قَدْ قَتَلَ رَبَّكُمَا لَيْلَةَ كَذَا وَكَذَا**»(٣).

---

(١) رواه البخاري (٣٧٥٧)، والنسائي في "الكبرى" (٢٠١٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤/ ٢٦).

(٢) رواه البخاري (٣٠٠٧)، ومسلم (٢٤٩٤)، وأبو داود (٢٦٥٠)، والترمذي (٣٣٠٥)، والنسائي في "الكبرى" (١١٥٢١)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٤٩٩)، وأحمد في "المسند" (٦٠٠)، والبزار في "المسند" (٥٣٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٣٩٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٤٣٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٤٣٤)، وفي "الشعب" (٨٩٢٦).

(٣) "تاريخ الطبري" (٢/ ٢٩٦)، و "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" لصهيب عبد الجبار (١٥/ ٤١)، وحسنه الألباني في "فقه السيرة" ص٣٥٩.

واتە: خواکەی من خواکەی هەردووکتانی کوشت ئەمشەو.

ئەوەبوو کە: «فَوَجَدُوا الْيَوْمَ هُوَ الَّذِي قُتِلَ فِيهِ كِسْرَى»(١).

واتە: بینییان (کیسرا) ئەو ڕۆژە کوژراوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە.

**٧. هەواڵدان بە هەموو ڕووداوەکانی پێش ڕۆژی دوایی:**

* عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: «قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَامًا، مَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، إِلَّا حَدَّثَ بِهِ»(٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداین هەر لە سەردەمی خۆیەوە چی ڕوو دەدات تا ڕۆژی دوایی، لە یەك دانیشتندا.

هەروەکوو لە ژیانی هاوەڵاندا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی شەهیدبوونی داوە بە (عمر بن الخطاب وعثمان بن عفان وعلي بن أبي طالب) و (حسين) لەلای ڕووباری فورات و ... هەتا دوایی.

- وە هەواڵی دەسەڵاتدارانی دوای خۆی داوە:

* قَالَ حُذَيْفَةُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا، فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ نُبُوَّةٍ»، ثُمَّ سَكَتَ(٣).

واتە: لەپاش پێغەمبەرایەتی (خلافة) دێت لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی، پاشان پشتاوپشت دێت، پاشان دەسەڵاتدارانی ستەمکار، پاشان (خلافة) دەگەڕێتەوە لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی.

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٦٢٦).

(٢) رواه البخاري (٦٦٠٤)، ومسلم (٢٨٩١)، واللفظ له، وأبو داود (٤٢٤٠)، والحاكم في "المستدرك" (٨٤٩٩).

(٣) رواه أحمد في "المسند" (١٨٤٠٦)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والبزار في "المسند" (٢٧٩٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٥)، و "المشكاة" (٥٣٧٨)، وفي "المسند الموضوعي" لصهيب عبد الجبار (٢).

لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەکوو خۆی دەفەرموێت: «الْخِلَافَةُ بَعْدِي فِي أُمَّتِي ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ»[١].

واته: (خلافة) لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی لەپاش من سی ساڵ دەبێت، پاش ئەوە پاشایەتی دەبێت.

ئەوەبوو لەپاش (چوار خەلیفەی ڕاشیدین و معاوية) ﷺ بوو بە پاشایەتی و پشتاوپشت، هەر لە سەردەمی ئەمەوییەکان و عەبباسییەکان و عوسمانییەکانەوە، وە پاش ئەمان دەسەڵاتدارانی ستەمکار و (جبابرة) دێت، وە پاش ئەوانیش خەلافەت لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی دەگەڕێتەوە.

ئەمانە و زۆر بابەتی تر لە هەواڵەکانی ڕابوردوو و داهاتوو و کەسانی دیاریکراو ... پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە، کە هەمووی بە ڕێگەی وەحی پێی گەیەنراوە.

  

(١) رواه مسلم (١٨٢١)، والترمذي (٢٢٢٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٤٣)، والبزار في "المسند" (٣٨٢٨)، والطبراني في "الكبير" (٦٤٤٢)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٣٣، وابن بطة في "الإبانة" (٨/ ٢٠٥)، والآجري في "الشريعة" (٤/ ١٧٥٩)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢٣١٣).

# هەواڵی زانستی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ

## (الإعجاز العلمي في الأحاديث النبوي)

هەواڵی زانستی (الإعجاز العلمي) لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ زۆرن، بە شێوەیەکی کورت ئاماژەی پێ دەکەین، تا ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەحییە و لەلایەن خواوەیە ﷻ.

١. لە هەموو ئاوێك منداڵ نابێت، وەکوو دەفەرموێت: «مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، ...»[(١)].

وە بوونی کوڕ و کچ لە جۆری ئاوەکان، وەکوو دەفەرموێت: «فَعَلَا مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ، أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللهِ، وَإِذَا عَلَا مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ، آنَثَا بِإِذْنِ اللهِ»[(٢)].

واتە: زاڵبوونی هەر لایەکیان دەبێتە هۆکاری دروستبوونی ئەو ڕەگەزە بە ئیزنی خوا ﷻ.

وە هەواڵدان بە دروستبوون و ڕۆح کردن بە بەری منداڵدا لە سکی دایکیدا و لە کاتێکی دیاریکراودا.

٢. هەواڵدان لەسەر بوونی (٣٦٠) جومگە لە لاشەی ئادەمیزاددا، وەکوو دەفەرموێت: «إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلَاثِمِائَةِ مَفْصِلٍ»[(٣)].

وە ئامۆژگاریکردن بە ئاونەخواردنەوە بەپێوە و گەدە کردنە سێ بەشەوە لەکاتی خواردندا، وە خەوتن لەسەر لای ڕاست ... .

---

(١) رواه مسلم (١٤٣٨)، وأحمد في "المسند" (١١٧٧٨)، والطبراني في "الأوسط" (٨١٠٤)، والطيالسي في "مسنده" (٢٢٨٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٧٠٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٤٣١١)، وفي "الأسماء والصفات" (٢٨٥).

(٢) رواه مسلم (٣١٥)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٣٢)، والحاكم في "المستدرك" (٣/٥٤٨)، والطبراني في "الكبير" (١٤١٤)، وفي "الأوسط" (٤٦٧)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٦٥٩).

(٣) رواه مسلم (١٠٠٧)، والنسائي في "عمل اليوم والليلة" (٨٣٧)، والطبراني في "الأوسط" (٤٠٥)، وفي "الشاميين" (٢٨٦٤)، والمروزي في "تعظيم قدر الصلاة" (٨١٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧٨٢٢)، وفي "الشعب" (١٠٦٤٧)، وأبو الشيخ الأصبهاني في "العظمة" (٥/١٦٢٠)، وابن منده في "التوحيد" (٩٠).

٣. ئاماژەدان بە نەخۆشی تازە کە لەوەوپێش نەبووە، ئەویش لە ئەنجامی تاوانکاریدا، وەکوو دەفەرموێت: «لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا»[١].

واته: تاوان لە هەر گەلێکدا بڵاوبێتەوە و بە ئاشکرا بیکەن دەبێتە هۆکاری نەخۆشی تاعون و جۆرە دەردێك کە لە گەلانی پێشوودا نەبووە، بە نموونەی (ئایدز و ئەنفلوەنزا ...).

٤. ئاماژەدان بە کەڵەشاخ گرتن، وەکوو دەفەرموێت: «إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الحِجَامَةُ»[٢].

٥. ئاماژەدان بە ڕەشکە خواردن، وەکوو دەفەرموێت: «عَلَيْكُمْ بِالْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ»[٣].

٦. هەواڵدان بە هەڵگری دەرد و دژەکەی لەسەر باڵی مێش، وەکوو دەفەرموێت: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ، فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالأُخْرَى شِفَاءً»[٤].

واته: گەر مێشێك کەوتە ناو خواردنەوەی کەسێکتانەوە با نوقمی کات تیایدا، پاشان فڕێی

---

(١) رواه ابن ماجه (٤٠١٩)، والحاكم في "المستدرك" (٤/ ٥٨٢)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، ووافقه الذهبي، وقال الألباني: قلت: بل هو حسن الإسناد، ورواه البزار في "المسند" (٦١٧٥)، والطبراني في "الأوسط" (٤٦٧١)، وفي "الشاميين" (١٥٥٨)، والبيهقي في "الشعب" (٣٠٤٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣٣٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٠٦)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٩٧٨).

(٢) رواه البخاري (٥٦٩٦)، ومسلم (١٥٧٧)، والترمذي (١٢٧٨)، والنسائي في "الكبرى" (٧٥٣٧)، وأحمد في "المسند" (١٢٠٤٥)، وأبو يعلى في "مسنده" (٣٧٥٨)، والطبراني في "الكبير" (٦٧٨٤)، وفي "الأوسط" (٢٨٣١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٣٤٣٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٩٥٠٩)، وأبو نعيم في "الطب النبوي" (٦٤٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٨/ ٢٠).

(٣) رواه النسائي في "الكبرى" (٧٥٣٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٠٧١)، وأحمد في "المسند" (٢٥٠٦٧)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والبزار في "المسند" (٢٠٩٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٨٤٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٩٠٥).

(٤) رواه البخاري (٣٣٢٠)، ومسلم (٣٥٠٥)، وأبو داود (٣٨٤٤)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٠٥)، والبزار في "المسند" (٩٨٧٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٩٨٦)، والطبراني في "الأوسط" (٢٣٩٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٢٩١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١١٩١)، وأبو نعيم في "الطب النبوي" (٦٩٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٨١٣).

**بدات، لەبەر ئەوەی لە باڵێکیدا دەرد و لە باڵەکەی تریدا شیفا هەیە.**

**وە بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بوارەدا، گەڕانەوە بۆ کتێبەکانی:**

- "الطب النبوي" لابن القيم رحمه الله.
- "الطب النبوي" لأبي نعيم الأصفهاني رحمه الله.
- "الأمراض والكفارات والطب والرقيات" لضياء الدين المقدسي رحمه الله.

**وە لە سەرچاوە تازەکان، وەك:**

- "الإعجاز العلمي في السنة النبوية" لصالح بن أحمد.
- "الإعجاز العلمي في القرآن والسنة" لعبد الله المصلح.
- "الإعجاز العلمي" لمحمد كامل.
- "الإصابة في حديث الذبابة" لخليل إبراهيم.
- "الأحاديث النبوية" لأحمد بن حسن - رسالة ماجستير.
- "الطب النبوي" لعلي مؤنس ... .

  

# پارێزراوی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە

## (معصومية النبي ﷺ)

لە هەمووی گرنگتر پارێزراوی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەلایەن خواوە بەتایبەت، کە ئەمە دڵنیایی و متمانەیی تەواو دەدات بە وەرگرتنی هەموو فەرموودە (صحيح)ەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی باوەڕ و کارکردنەوە، هەر بەو هۆکارەشەوە هاوەڵان ﷺ پەیوەستی تەواویان بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەبووە لە هەموو بوارەکانی دین و دونیادا، وە مێژووی ژیانیشی شاهیدحاڵی تەواوی پارێزراوی (معصومية) خوای خۆیەتی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ.

ئەگەر خوای گەورە ﷻ هەواڵی پاراستنی پێدابێت لە زیانی خەڵکی، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المائدة : ٦٧]؛ ئەوا پاراستنی لە بوارە دینی و زانستی و پێغەمبەرایەتییەکەیدا لەپێشترە، بۆیە کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە پاراستنی فەرموودە لە چوارچێوەی پاراستنی قورئاندایە، خوای گەورەش ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩﴾ [الحجر : ٩]، لەبەرئەوەی شیکەرەوە و ڕوونکەرەوە و جێبەجێکاری قورئانە.

وە (معصوم) بوونی؛ پێویستییەکی پێغەمبەرایەتی و پشتیوانییەکە بۆ گەیاندنی دین، وە پێناسەی (معصومية)یش بریتییە لە: «هي حفظ الله عز وجل للأنبياء بواطنهم وظواهرهم من التلبس بمنهي عنه، ولو نهي كراهة ولو في حال الصغر، مع بقاء الاختيار تحقيقاً للابتلاء»[1].

واتە: پاراستنێکی خواییە بۆ پێغەمبەران ﷺ، پاراستنی ناوەڕۆك و دەرەوە لە هەموو خراپەیەك، تەنانەت لە منداڵیشدا لە کارە مەکرووهەکانیش، لەگەڵ هێشتنەوەی ئازادی مرۆڤایەتی تیایاندا بۆ زیاتر تاقیکردنەوە.

کەواتە دەبێت کامڵترینی کەسانی ئادەمیزاد بن، بۆیە کۆدەنگی هاوەڵان و زانایان لەسەر ئەمەیە، وەکوو (ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «فَإِنَّ الْقَوْلَ بِأَنَّ الْأَنْبِيَاءَ مَعْصُومُونَ عَنْ الْكَبَائِرِ دُونَ

(١) "رد شبهات حول عصمة النبي صلى الله عليه وسلم في ضوء السنة النبوية الشريفة" لعماد السيد الشربيني ص٢٠.

الصَّغَائِرِ هُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ عُلَمَاءِ الْإِسْلَامِ»[(١)]. وە دەڵێت: «وَالْقَوْلُ الَّذِي عَلَيْهِ جُمْهُورُ النَّاسِ وَهُوَ الْمُوَافِقُ لِلْآثَارِ الْمَنْقُولَةِ عَنْ السَّلَفِ إثْبَاتُ الْعِصْمَةِ مِنْ الْإِقْرَارِ عَلَى الذُّنُوبِ مُطْلَقًا»[(٢)].

واتە: قسە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەران پارێزراون لە تاوانی گەورە بێجگە لە بچووك، قسەی زانایانی ئیسلامە، وە گونجاوە لەگەڵ دەقەکاندا کە پاراستنیانە لە بەردەوامبوون لەسەری.

وە دەڵێت: «بَلْ هُوَ لَمْ يَنْقُلْ عَنْ السَّلَفِ وَالْأَئِمَّةِ وَالصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ إلَّا مَا يُوَافِقُ هَذَا الْقَوْلَ»[(٣)].

واتە: بەڵکوو لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و چینی دوای ئەوان و زانایانی پێشوو هیچ شتێك نەوتراوە، بەدەر لە گونجاوی لەگەڵ ئەم قسەیەدا.

وَقَالَ (الْشَّاطِبِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «فَاعْلَمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُؤَيَّدٌ بِالْعِصْمَةِ مَعْضُودٌ بِالْمُعْجِزَةِ الدَّالَّةِ عَلَى صِدْقِ مَا قَالَ وَصِحَّةِ مَا بَيَّنَ»[(٤)].

واتە: بزانە کە پێغەمبەر ﷺ پشتیوانکراوە بە پاراستن و بەهێزکراوە بە موعجیزە، تا بەڵگە بێت لەسەر ڕاستگۆیی وتەکانی و تەواوی ڕوونکردنەوەکانی.

وَقَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ: «وَالْكَلَامُ فِي هَذَا الْمَقَامِ مَبْنِيٌّ عَلَى أَصْلٍ: وَهُوَ أَنَّ الْأَنْبِيَاءَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ مَعْصُومُونَ فِيمَا يُخْبِرُونَ بِهِ عَنْ اللَّهِ سُبْحَانَهُ وَفِي تَبْلِيغِ رِسَالَاتِهِ بِاتِّفَاقِ الْأُمَّةِ وَلِهَذَا وَجَبَ الْإِيمَانُ بِكُلِّ مَا أُوتُوهُ ... وَهَذِهِ الْعِصْمَةُ الثَّابِتَةُ لِلْأَنْبِيَاءِ هِيَ الَّتِي يَحْصُلُ بِهَا مَقْصُودُ النُّبُوَّةِ وَالرِّسَالَةِ؛ ... وَالْعِصْمَةُ فِيمَا يُبَلِّغُونَهُ عَنْ اللَّهِ ثَابِتَةٌ فَلَا يَسْتَقِرُّ فِي ذَلِكَ خَطَأٌ بِاتِّفَاقِ الْمُسْلِمِينَ»[(٥)].

واتە: قسە لێرەدا لەسەر بنەمایەکە، ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەران پارێزراون لەوانەی کە لەلایەن خواوە بە خەڵکی دەگەیەنن وەکوو پەیامی خوا، ئەمە شوێنی کۆدەنگی هەموو

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٣١٩).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٢٩٣).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٣١٩).

(٤) "الموافقات" للشاطبي (٤/ ٤٧٠).

(٥) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٢٨٩، ٢٩٠).

موسوڵمانانە، لەبەرئەوە دەبێت باوەڕ بێنن بەوەی کە پێیانە، ئەمە پاراستنێکی تایبەتە بە پێغەمبەران، بەمە مەبەستی پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەی دێتە دی، ئەمە هەڵەی تێدا نابێت بە کۆدەنگی هەموو موسوڵمانان.

وە لێخۆشبوونیش بۆ پێغەمبەران لەو کارانەدایە کە بە ئیجتیهاد کردوویانە و خوای گەورە ویستی تری تێدا بووە، نەك تاوان و بەردەوامی بێت لەسەری، وە تەنانەت نەتوانینی (شفاعة) لە ڕۆژی دواییدا لەلایەن پێغەمبەرانەوە هەر بەو هۆکارەوەیە، نەك تاوانبار بن، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ﴾ [غَافِر : ٥٥].

واتە: ئارام بگرە، وادەی خوا حەقە، داوای لێخۆشبوون بکە بۆ تاوانەکانت.

ئەم داوای لێخۆشبوونە بۆ تاوان ئیمامی (القرطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «قِيلَ: لِذَنْبِ أُمَّتِكَ ... وَقِيلَ: لِذَنْبِ نَفْسِكَ عَلَى مَنْ يُجَوِّزُ الصَّغَائِرَ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ. وَمَنْ قَالَ لَا تَجُوزُ قَالَ: هَذَا تَعَبُّدٌ لِلنَّبِيِّ عَلَيْهِ السَّلَامُ بِدُعَاءٍ»[1].

واتە: زانایان دەڵێن: مەبەست پێی تاوانی گەلەکەیەتی، وە دەڵێن: مەبەست پێی تاوانی خۆیەتی، لەسەر ئەو ڕایەی کە تاوانی بچووك لەسەر پێغەمبەران هەیە، وە دەڵێن: بەڵکوو جۆرێکە لە عیبادەتەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ، بە داوای لێخۆشبوونکردن.

وە دەفەرموێت: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ﴾ [الفَتْح : ٢].

واتە: تاوەکوو خوا لە تاوانەکانی پێشووت خۆش بێت (ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە بەندایەتی و ئادەمیزادێتی دەرناچێت، بۆیە پێویستی بە لێخۆشبوون دەبێت).

یاخود پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ، فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ»[2].

---

(١) "تفسير القرطبي" (١٥/ ٣٢٤) في تفسير سورة [غَافِر : آيَة : ٥٥].

(٢) رواه مسلم (٢٧٠٢)، وأبو داود (١٥١٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٢٠٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٣١)، وأحمد في "المسند" (١٧٨٤٨)، والحاكم في "المستدرك" (١٨٨٢)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٨)، وفي "الدعاء" (١٨٣٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٣٣٤١)، وفي "الشعب" (٦٣١)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١١٢٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٨٧)، وابن مبارك في "الزهد" (١١٤٠).

واتە: تارماییەکە بەسەر دڵمدا دێت، منیش لە ڕۆژێکدا سەد جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم.

قَالَ (ابن حزم) ﷬: «أَنه يَقع من الْأَنْبِيَاء السَّهْو عَن غير قصد وَيَقَع مِنْهُم أَيْضا قصد الشَّيْء يُرِيدُونَ بِهِ وَجه الله تَعَالَى والتقرب مِنْهُ فيوافق خلاف مُرَاد الله تَعَالَى إِلَّا أَنه تَعَالَى لَا يقرهم على شَيْء من هذَيْن الْوَجْهَيْنِ أصلا»[(١)].

واتە: لە پێغەمبەراندا ﵈ لێتێکچوونێك بەبێ مەبەست دەبێت، وە هەندێك شتی تریشیان لێ ڕوو دەدات، کە مەبەستیان خوایە ﷻ و نزیکبوونەوەیە لێی بەو هۆکارە، بەڵام مەبەستی خوا جیاواز و پێچەوانە دەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا خوای گەورە بەردەوام نایانهێڵێتەوە لەسەر ئەم دوو جۆرە کارە، بەڵکوو ئاگاداریان دەکاتەوە و بەو شێوەیە نایانهێڵێتەوە، وەکوو بەسەرهاتی ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾، یاخود بەندییەکانی بەدر.

(حسين بن محمد) دەڵێت: «وينبغي تقييد السهو منهم - كما ذهب إليه أكثر الفقهاء والمتكلمين - بالأفعال دون الأقوال، لأن الأدلة إنما جاءت في سهوهم في الأفعال، دون الأقوال، وقد حكى العلامة القاضي عياض الإجماع على امتناع السهو فيها، وهذا هو الصواب الذي لا محيد عنه»[(٢)].

واتە: پێویستە ئەم لێتێکچوونە تایبەت بکەین، وەکوو زۆری زانایان باسیان کردووە بە کردارەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ نەك فەرموودەکانی، لەبەرئەوەی هەرچی بەڵگەی لێتێکچوون هەیە؛ لە کردارەکاندا بووە، نەك قسەکردنەکان، ئەمە (قاضي عياض) ﷬ کۆدەنگی زانایانی لەسەر باس دەکات.

کەواتە ئەم ئیجتیهادانەش بەس لە کرداردا بووە، وەکوو: لێتێکچوونی نوێژ، یاخود مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێکدا، وەکوو (ابن أم مكتوم) کە ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ی لەسەر هاتە خوارەوە،

---

(١) "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٤/ ٢).

(٢) "السنة النبوية وحي من الله محفوظة كالقرآن الكريم" لحسين بن محمد ص٢٠، و "الشفا بتعريف حقوق المصطفى" للقاضي عياض ص٦٧٥.

یاخود بەندییەکانی بەدر، یاخود نوێژکردن لەسەر (ابن سلول) کاتێك کە مرد، یاخود داوای لێخۆشبوونکردن بۆ مامی (أبو طالب)، یاخود حەرامکردنی خواردنێك لەسەر خۆی لەبەر خێزانێکی ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ [التحريم : ١]، بۆ ئەوەی ئادەمیزادێتی و دەرنەچوون لە بەندایەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی بسەلمێنرێت و فەرموودەکەی خوای پەروەردگاریش لە ڕوانگەی خەڵکەوە بێتە دی کە پێی دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ [الكهف : ١١٠]، واتە: ئەی (محمد ﷺ) بڵێ منیش کەسێکم وەکوو ئێوە، واتە وەکوو ئێوە ئادەمیزادم، تایبەتمەندێتیم لە ئادەمیزادێتی دەرناچێت، جگە لەوە نەبێت کە من (وەحی)م بۆ دێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

بەڵام بە وتار و قسە و ڕێنمایی دینی و گەیاندنی؛ بە هیچ شێوەیەك هەڵەی تیادا نەبووە، لەبەر هۆکاری پاراستنی دین، کە بەرنامەی ڕاست و دروست و بێ هەڵەی خوای پەروەردگارە، چۆن دەبێت بە هەڵە بگەیەنرێت؟!

قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «لَمْ يَذْكُرْ فِي كِتَابِهِ عَنْ نَبِيٍّ مِنْ الْأَنْبِيَاءِ ذَنْبًا إلَّا ذَكَرَ تَوْبَتَهُ مِنْهُ»[١].

واتە: خوای گەورە لە قورئاندا باسی هەڵەی هیچ پێغەمبەرێکی نەکردووە، هەر لەگەڵیدا باسی لێخۆشبوونیشی لەسەر کردووە.

وە ئەوانەیش کە بە ئیجتیهاد هەژمار دەکرێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ، وەکوو (الشنقيطي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنِ اجْتَهَدَ، فَإِنَّهُ إِنَّمَا يَجْتَهِدُ بِوَحْيٍ مِنَ اللهِ يَأْذَنُ لَهُ بِهِ فِي ذَلِكَ الِاجْتِهَادِ، وَعَلَيْهِ فَاجْتِهَادُهُ بِوَحْيٍ فَلَا مُنَافَاةَ»[٢].

واتە: گەر ئیجتیهادیش بێت؛ بە وەحی بووە، لەلایەن خواوە و ڕێگەی پێدراوە.

وە هەندێکیش لەو بابەتانە بۆ (تشريع) و تەواوبوونی یاساکانی ئیسلام بووە لەو کارانەدا، لەبەرئەوەی گەر ڕووی نەدایە نەدەزانرا چی بکرێت، وەکوو لێتێکچوونی نوێژ، یان داوای لێخۆشبوون بۆ بێبڕوا، یاخود نوێژکردن لەسەر دووڕووەکان ... .

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٥/ ١٤٨).

(٢) "دفع إيهام الاضطراب عن آيات الكتاب" للشنقيطي ص٢٢٣.

**بە کورتی:** پێغەمبەر ﷺ (معصوم)ە و پاراستنێکی تایبەتی هەبووە بۆ گەیاندنی بوارە دینییەکە و ڕوونکردنەوەکانی دونیاش، لە هەردوولا لەژێر چاودێری و پارێزراویێتیدا بووە، وە گەر لە بوارێکدا وەحی نەبووبێت لەدوای چاوەڕوانی؛ ئەوا ئیجتیهادی کردووە، گەر ڕازیبوونی خوای لەسەر بووبێت ئەوا وەکوو خۆی ماوەتەوە و هیچ لە بارەیەوە نەهاتووەتە خوارەوە، وە گەر نا؛ دوای ڕووداوەکە لەسەری هاتووەتە خوارەوە و لە (معصوم) بوون دەرنەچووە.

**وەکوو:** بڕینی دارخورماکانی جوولەکەکانی (بني نضير) بە ئیجتیهادی خۆی بۆ زیاتر دڵنیابوونیان کە دووڕووەکان پشتگیرییان ناکەن و درۆ دەکەن، خوای پەروەردگاریش پشتیوانی کرد و فەرمووی: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥﴾ [الحشر: ٥].

واتە: هەر دارخورمایەکتان بڕیبێتەوە یا وازتان لێهێنابێت بە ئیزنی خوا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئایەتێك لەوەوپێش نەهاتبووە خوارەوە.

## دابەشکردنی سوننەت بۆ کارە دینییەکان و کارە دونیاییەکان
## (تقسيم السنة إلى سنة تشريعية أو غير تشريعية)

ئەم دابەشکردنە لەم دواییەدا هاتووەتە کایەوە، بە هۆکاری قۆستنەوەی هەندێك ڕای زانایان لەسەر بوونی تاوانی بچووك لەسەر پێغەمبەران ﷺ، کە دەڵێن: تاوانی بچووك لەسەر پێغەمبەران دەشێت، بە مەرجی بەردەوامنەبوون لەسەری، یاخود دەیکەن بە دوو بەشەوە: «صغائر خسة، وصغائر غير خسة. فصغائر الخسة هى التي ينسلك بها فاعلها مع الأراذل والسفلة ... أما صغائر غير الخسة، فقالوا إنها التي لا تشعر بنقص، ... وقد ذكر القاضي عياض أن العلماء إزاء تجويز هذا النوع من الصغائر على الأنبياء ثلاث فئات: الفئة الأول أجازت صدور هذه الصغائر ... أما الفئة الثانية فتقول بالجواز العقلي، ... ولكنهم توقفوا عن القول بالوقوع، فلم يثبتوه، ولم ينفوه لتعارض الأدلة عندهم ... أما الفئة الثالثة فتقول بعصمتهم من الصغائر كعصمتهم من

الكبائر»[١].

واته: تاوانی بچووك كه لەكەداریان بكات وەكوو تاوانباران، وە تاوانێكی بچووك كه لەكەداریان نەكات و هەست نەكرێت بە ناتەواوی پێیانەوە، (قاضي عياض) رحمه الله لە زانایانەوە سێ ڕا دەگوازێتەوە لەم بارەیەوە:

یەكەم: دەشێت تاوانی بچووك لە پێغەمبەران بووەشێتەوە.

دووەم: (متكلمين) دەڵێن: بە عەقڵ دەشێت هەبێت، بەڵام وەستاون لە بڕیاردانیدا لەسەر پێغەمبەر ﷺ، لەبەر دژایەتیكردنی بەڵگەكان لەگەڵ یەكتر.

سێیەم: پارێزراوییان لە تاوانی بچووك وەكوو گەورە.

هەر بەم هۆكارەیشەوە دابەشكردنێكی تریان هێناوەتە كایەوە، بەناوی ئەوەی كه پێغەمبەر ﷺ خاوەنی دوو بەشە، وە ئیجتیهادێكی پێكاویەتی و ئیجتیهادێك نەپێكاوە.

ئەم بڕیارە دراوە لەسەر بنەمای ئەو دەقانەی كه ئاگاداركردنەوەی خوایی لەسەرە بۆ پێغەمبەر ﷺ، وەكوو: ئیزندانی دووڕووەكان لە جیهاددا و بەندییەكانی بەدر و حەرامكردنی خواردنێك لەسەر خۆی و داوای لێخۆشبوون بۆ مامی و نوێژكردن لەسەر (ابن سلول)ی سەركردەی دووڕووەكان ... هەمووی خوای گەورە ئاگاداری كردووەتەوە و بەردەوامی نەكردووە لەسەری، لەبەر وادەكەی خۆی كه پێی دەفەرموێت: ﴿لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ [النساء: ١٠٥]. تا كارەكانت لەنێوان خەڵكیدا بەو شێوەیە بێت كه خوای گەورە ڕێنموونیت دەكات، بۆیە دەفەرموێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٤٣﴾ [التوبة: ٤٣]، ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [الأنفال: ٦٧]، ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَ﴾ [التحريم: ١]، ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ۝١١٣﴾ [التوبة: ١١٣]، ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا﴾ [التوبة: ٨٤]، ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١﴾ [عبس: ١]، و

---

(١) "آيات عتاب المصطفى صلى الله عليه وسلم في ضوء العصمة والاجتهاد" لدكتور عويد بن عيَّاد بن عايد المطرَفي ص٦٦ – ٧٠.

دووعاکردن لە بێبڕوایان لە قنووتدا: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ [آل عمران: ١٢٨].

لە ئەنجامی ئەم دابەشکردنەدا سوننەت کرا بە دوو بەشەوە، ئەوانیش (السنة التشريعية وغير التشريعية)، ئەمەش ئەو مانایە دروست دەکات کە هەندێك لە سوننەت نابێتە یاسا و شەرع بۆ موسوڵمانان.

**بۆ وەڵامی ئەم دابەشکردنە دەوترێت:**

**١-** ئەم جۆرە دابەشکردنە بەو مانایە لە زانایانی ناودارانی پێشووی ئەهلی سوننەتدا نەهاتووە، بەڵکوو وەکوو باسمان کرد لە باسی (معصوم)بوونی پێغەمبەران لە تاوانی گەورە و بچووکدا ئەم بابەتە باسکراوە، بەڵام نەیانگەیاندووەتە سەر سوننەتەکانی ... بەڵکوو ئەم جۆرە باس و دابەشکردنە لە سەردەمی (محمد رشيد رضا)وە رحمه الله و بەدوای خۆیدا سەری هەڵداوە، وەکوو:

✍ محمد رشيد رضا لە "مجلة المنار" (٨٥٨/٩)، وە لە تەفسیری ئایەتی (٤٣)ی سوورەتی [التوبة] دا دەڵێت: «وَقَدْ كَانَ الْإِذْنُ الْمُعَاتَبُ عَلَيْهِ اجْتِهَادًا مِنْهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا لَا نَصَّ فِيهِ مِنَ الْوَحْيِ، وَهُوَ جَائِزٌ وَوَاقِعٌ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ، وَلَيْسُوا بِمَعْصُومِينَ مِنَ الْخَطَأِ فِيهِ، وَإِنَّمَا الْعِصْمَةُ الْمُتَّفَقُ عَلَيْهَا خَاصَّةٌ بِتَبْلِيغِ الْوَحْيِ بِبَيَانِهِ وَالْعَمَلِ بِهِ»[1].

واتە: ئیزندانی بێبڕوایان لە جیهاددا ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ بوو، لە شتێکدا کە دەق نەبێت لەسەری، پێغەمبەران نەپارێزراون لە هەڵە لەم بوارانەدا، پارێزراوییان لە گەیاندنی دیندا بووە. (هەڵەکە لێرەدایە، چونکە پارێزراوی لانەچووە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، گەر نا، خوای گەورە جل جلاله چۆن ئاگاداری دەکاتەوە)؟

✍ محمد الغزالي لە "كيف نفهم الإسلام".

✍ يوسف القرضاوي لە "السنة مصدرا للمعرفة" ص٤١.

✍ محمد طاهر ابن عاشور لە "مقاصد الشريعة".

ئەمانە و چەندەهای تر کە (یوسف کمال) لە کتێبی "العصريون معتزلة اليوم" ص٥٣ دا باسی لێیانەوە کردووە.

---

(١) "تفسير المنار" لمحمد رشيد رضا (٤٠٢/١٠) في تفسير سورة [التوبة: آية: ٤٣].

٢- هەر یاسا و بنەمایەك دابنرێت بەبێ هیچ بەستنەوە و یاسا و مەرجێکی شەرعی (ضوابط)؛ ئەوە کاری بیدعەکارانە، وەکوو فیرەقە گومڕاکان لە ناو و سیفەتی خوادا ﷻ لەژێر ناونیشانی (نابێت سیفاتەکانی "خالق" لە "مخلوق" بچێت) باوەڕیان بە سیفاتەکانی خوا نەماوە بەبێ هیچ سنووردارییەکی زانستی، وە هەروەها قەدەرییەکان لە بێگەردکردنی خوا لە ستەم (تنزیه الله تعالی من الظلم)؛ باوەڕیان بە قەدەر نەما، «وَالْمَقْصُودُ هُنَا: أَنَّ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يُدْفَعُ بِالْأَلْفَاظِ الْمُجْمَلَةِ كَلَفْظِ التَّجْسِيمِ»[(١)].

واتە: مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەت نەکرێنەوە بە هەندێك ووشەی کورت و مانای شاراوە.

بۆیە ئەم دابەشکردنەش هیچ (ضوابط العلمیة)ی تێدا نییە، بە چ پێوەرێك کارە دینییەکانی لە دونیاییەکانی جیا بکەینەوە؟ لە کاتێکدا کارە سروشتییە دونیاییەکانی نەبێت وەك برسییەتی و تینوویەتی ... هەرچی ماوەتەوە سوننەتە و باشترین ڕێی کامڵبوونە.

وە هەروەها بە چ پێوەرێك بزانین کە لە ئیجتیهادە دونیاییەکاندا پێکاویەتی یاخود نەیپێکاوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا گەر هەڵسەنگاندن بۆ ئەو کارانەی پێشوو بکەین، دەبینین پێکاندنی تێدا بەدی دەکرێت، وەکوو ئیزندانی دووڕووەکان لە جیهاددا، تا موسوڵمانان لە کۆسپ و تەگەرەیان دوور بن، وەکوو (ابن سلول) کە لە شەڕی ئوحوددا سێ سەد کەسی گێڕایەوە ...، وە گۆڕینەوەی بەندییەکانی بەدر، لە کاتێکدا دواجار هەموویان موسوڵمان بوون، وە نوێژکردن لەسەر (ابن سلول) بۆ دڵنەواییکردنی دڵی کوڕەکەی و کەس و هۆزە موسوڵمانەکەی، یاخود پشتهەڵکردن لە (ابن أم مکتوم) کە کاتی تر هەیە بۆ پێگەیشتنی، بەڵام هەوڵدان بۆ موسوڵمانبوونی گەورەکانی قوڕەیش، تا ببنە پشتیوانی گەورە بۆ ئیسلام، ئەمانە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندەی لەسەرە کە غەیب و دوارۆژی کارەکان نازانێت.

**هەموو ئەو کارانەی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ئاگادار کراوەتەوە بەم شێوەیە هەڵدەسەنگێندرێت:**

أ. لە چوارچێوەی (توحید)دا بەس خوای پەروەردگار کامڵە و کامڵی بۆ کەسی تر نییە، گەر پێغەمبەریش بێت قابیلی ڕەخنەیە.

---

(١) "مجموع الفتاوی" لابن تیمیة (٥/ ٤٣٣).

ب. بەندایەتی و پێغەمبەرایەتی (عبده ورسوله) دەبێت لە پێغەمبەردا ﷺ دەرکەوێت.

ت. جۆرێك لە جۆرەكانی پەرستن (عبادات) داوای لێخۆشبوونە و پێویستی بە لێبوردەیی خواییە، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَوْلَا أَنَّكُمْ تُذْنِبُونَ لَخَلَقَ اللهُ خَلْقًا يُذْنِبُونَ يَغْفِرُ لَهُمْ»[(١)].

واتە: گەر ئێوە تاوان نەکەن؛ ئەوا خوای گەورە کەسانێك دروست دەکات تاوان بکەن تا لێیان خۆش بێت (بەو مانایەی دەبێت لێبوردەیی "غفور" ی خوایی کار بکات).

ث. زانایان دەڵێن ئەمانە هەڵە و لەبیرچوونە (الخطأ والنسیان)، وە ئەم دوانەش وادەی خوایی لەسەرە بە لێخۆشبوون، وەکوو دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦].

ج. وە ئەمانە ئەوە دەگەیەنێت کە چاودێری تەواوی خوایی لەسەرە و کار و کردەوەکانی لەژێر چاودێری وەحیدایە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ﴾ [هُود : ١١٢]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النِّسَاء : ١]، ﴿وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ [الطُّور : ٤٨].

واتە: بەو شێوەیەی کە فەرمانت پێدەکەین جێبەجێکار بە، وە خوای گەورە چاودێریکارتانە، وە ئەی (محمد ﷺ) ئارامگر بە لەسەر یاساکانمان، تۆ لەژێر چاودێری ئێمەدایت.

٣- لە پێناسەی فەرموودەدا زانایان دەڵێن: «مَا أُضِيْفَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَوْلاً أَوْ فِعْلاً أَوْ تَقْرِيْرَاً أَوْ صِفَةُ خِلْقِيَّة أَوْ خُلُقِيَّة»[(٢)].

واتە: فەرموودە ئەوەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لە قسە و کار و بێدەنگبوونی لەسەر کارێك، یان سیفاتە دروستکراوەکانی، یاخود سیفاتەکانی ڕۆژانەی.

(١) رواه مسلم (٢٧٤٨)، والترمذي (٣٥٣٩)، وأحمد في "المسند" (٢٣٥١٥)، والطبراني في "الكبير" (٣٩٩١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٤٢٠١)، والبيهقي في "الشعب" (٦٦٩٨).

(٢) "الوسيط في علوم ومصطلح الحديث" لأبو شُهبة ص٢٤، و "شرح علل الترمذي" لابن رجب (١/ ١٥٦)، و "فتح المغيث" للسخاوي (١/ ٢٢)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٤٧)، و "مصطلح الحديث" للعثيمين ص٥.

مەبەست لێرەدا (صفة خُلُقِيَّة) سوننەتە کرداری و هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانەی ژیانە، کە سوننەت و یاسا و شەرعە بۆ موسوڵمانان، کەواتە گەر وابێت ئەوا ئەو کارانەی کە سوننەت نییە (غير التشريعية)یە، لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی ڕای زانایانە.

٤- لەلایەکیشەوە ئەو کارانە هەمووی بوون بە تەواوبوونی یاسا و شەریعەتی ئیسلام، کە حوکمی نوێژکردنە لەسەر دووروەکان و داوای لێخۆشبوونکردن بۆیان و ... .

٥- ئەوەی ئاشکرایە لەم دابەشکردنەدا لێدانی سوننەت و لەکارخستنیەتی بە ناوێکی زانستییەوە، وەکوو چۆن خەوارجەکان بە ئاشکرا سوننەتیان پەراوێز خست، وە فیرەقە عەقلانییەکانیش بەناوی (خبر الآحاد)ەوە، وە پاشماوەکانی تریش بەناوی (ظني الدلالة) نەگونجاندنی لەگەڵ بوارە زانستییەکاندا ... .

٦- وە سەرەتا و کۆتایی بەڵگەیان لەم دابەشکردنەدا ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت: «أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ»[(١)].

واتە: ئێوە شارەزاترن لە کاری دونیاییتاندا.

پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئەمەی فەرموو کە بینی خەڵك خورما موتوربە دەکات، وە مەبەستیش فەرمان و ئیجتیهاد نەبوو، وەکوو لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە دەفەرمویت: «إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنًّا، فَلَا تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ»[(٢)].

واتە: ئەگەر سوودی هەیە با بیکەن، من گومانێك بوو بردم، گومانەکەم لەسەر دامەنێن.

وەکوو (أحمد شاكر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وهذا الحديث مما طنطن به ملحدو مصر وصنائع أوربة فيها، من عبيد المستشرقين، وتلامذة المبشرين، فجعلوه أصلا يحِجُّون به أهل السنة

---

(١) رواه مسلم (٢٣٦٣)، وابن ماجه (٢٤٧١)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٢)، وأحمد في "المسند" (١٢٥٤٤)، وأبو يعلى في "مسنده" (٣٤٨٠).

(٢) رواه مسلم (٢٣٦١)، وأحمد في "المسند" (١٣٩٥)، والبزار في "المسند" (٩٣٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٩)، والطيالسي في "مسنده" (٢٣٠)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٧٢٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/٣٧٢)، والشاشي في "مسنده" (٧).

وأنصارها، وخدام الشريعة وحماتها، إذا أرادوا أن ينفوا شيئاً من السنة، وأن ينكروا شريعة من شرائع الإسلام، في المعاملات وشؤون الاجتماع وغيرها، يزعمون أن هذه من شؤون الدنيا، يتمسكون برواية أنس: "أنتم أعلم بأمر دنياكم"، والله يعلم أنهم لا يؤمنون بأصل الدين، ولا بالألوهية، ولا بالرسالة، ولا يصدقون القرآن، في قرارة نفوسهم، ومن آمن منهم فإنما يؤمن لسانه ظاهراً، ويؤمن قلبه فيما يخيل إليه، لا عن ثقة وطمأنينة، ولكن تقليداً وخشية، فإذا ما جد الجد، وتعارضت الشريعة، الكتاب والسنة، مع ما درسوا في مصر أو في أوربة، لم يترددوا في المفاضلة، ولم يحجموا عن الاختيار، فضَّلوا ما أخذوه عن سادتهم، واختاروا ما أُشْرِبَتْه قلوبهم! ثم ينسبون نفوسهم بعد ذلك، أو ينسبهم الناس، إلى الإسلام!! والحديث واضح صريح، لا يعارض نصَاً، ولا يدل على عدم الاحتجاج بالسنة في كل شأن، لأن رسول الله لا ينطق عن الهوى، فكل ما جاء عنه فهو شرع وتشريع ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ﴾، وإنما كان في قصة تلقيح النخل أن قال لهم: "ما أظن ذلك يغني شيئاً" فهو لم يأمر ولم ينه، ولم يخبر عن الله، ولم يسن في ذلك سنة، حتى يُتوسع في هذا المعنى إلى ما يُهدم به أصل التشريع»[1].

واتە: ئەم فەرموودەیە بیّبڕواکانی میسرِ کردوویانەتە هێنان و بردن، ئەوانە دەستکردی ئەورووپا و بەندەی ڕۆژهەڵاتناس و بلاوکەرەوانی مەسیحییەتن، کردوویانەتە بنەمایەك بۆ تانەدان لە پارێزراوی پێغەمبەر ﷺ لە ئیجتیهادەکانیدا، فەرموودەکەش ڕوونە و دژایەتی هیچ دەقێك ناکات و پێچەوانەی پارێزراوێتی و ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ ناکات و بەڵگەش نییە بۆ کارنەکردن بە سوننەتەکان، یاخود بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە وەحی نییە، فەرموودەکە باس لە موتوربەی خورما دەکات، کە هیچ فەرمان و ڕێگرییەك و هەواڵێکی خوایی تێدا نییە و یاسا و تەشریعێکیشی لەسەر بنیاد نەنراوە، تاوەکوو بیکەنە بەڵگە لەسەر ڕووخاندنی بنەمایەکی شەریعەت.

وە ئەمەش نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە زانستی بوارە دونیاییەکاندا پارێزراو نییە و دەشێت نەیپێکێت و بەو هۆکارەوە کارەکانی بکرێتە دوو بەش و هەرکەسە بە ئارەزووی

(١) هامش "المسند" للإمام أحمد رقم (١٩٣٥).

خۆی پۆلێنی بکات و ئەوەی عەقڵی نەیگرت و حەزی لێ نەکرد و بەباشی نەزانی بیخاتە ئەم بوارەوە و دەریکات لە سوننەت و جێبەجێکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ لە بواری لاشە و جەستە و نەخۆشییەکانیدا ڕێنموونییەکی یەکجار زۆری هەیە، وە لە بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا جۆری مامەڵە لەگەڵ خەڵکاندا و پەروەردەکردنی منداڵ و مامەڵە لەگەڵ خێزان و ژنهێنان، وە کاروباری ڕۆژانە و کێشەکاندا؛ چارەسەر و ڕێنمایی ووردی هەیە، پەراوێزکردنی ئەو هەموو لایە و خوێندنەوەی خاڵی بچووك؛ مانای گومڕاییە.



# بەشی سێیەم

## بەڵگەكان لەسەر بەڵگەیەتی فەرموودە

## (أدلة حجية السنة)

بەڵگەیەتی فەرموودە بنەمایەكی دینییە و بوارێكە لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا.

قَالَ (الشَّوْكَانِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «اعْلَمْ أَنَّهُ قَدِ اتَّفَقَ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ الْمُطَهَّرَةَ مُسْتَقِلَّةٌ بِتَشْرِيعِ الْأَحْكَامِ وَأَنَّهَا كَالْقُرْآنِ فِي تَحْلِيلِ الْحَلَالِ وَتَحْرِيمِ الْحَرَامِ، ... وَالْحَاصِلُ أَنَّ ثُبُوتَ حُجِّيَّةِ السُّنَّةِ الْمُطَهَّرَةِ وَاسْتِقْلَالَهَا بِتَشْرِيعِ الْأَحْكَامِ ضَرُورَةٌ دِينِيَّةٌ وَلَا يُخَالِفُ فِي ذَلِكَ إِلَّا مَنْ لَا حَظَّ لَهُ فِي دِيْنِ الإِسْلَامِ»[1].

واتە: كۆدەنگی ئەوانەی هەژمار دەكرێن بە زانا لە ئیسلامدا، لەسەر ئەوەیە كە سوننەت سەربەخۆیە لە یاساكانی ئیسلامدا و وەكوو قورئان وایە لە حەڵاڵ و حەرامكردندا، ئەمە پێویستییەكی دینییە، كەسێك پێچەوانەی نییە بێجگە لەوانەی كە هیچ بەشێكیان لە ئیسلامدا نییە.

### ئایەتە قورئانییەكان لەسەر بەڵگەیەتی سوننەت:

١. پەیوەستكردنی گوێڕایەڵی خوا بە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ [النساء: ٨٠].

واتە: ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكات؛ گوێڕایەڵی خوای كردووە.

وقال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ [النساء: ٥٩].

(١) "إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ٩٦، ٩٧).

**٢.** هەڕەشە بە نەبوونی ئیمان لەکاتی جێبەجێنەکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ [النساء: ٦٥].

قَالَ (السعدي) رحمه الله: «**أقسم تعالى بنفسه الكريمة أنهم لا يؤمنون حتى يحكموا رسوله فيما شجر بينهم، ... ثم لا يكفي هذا التحكيم حتى ينتفي الحرج من قلوبهم والضيق، وكونهم يحكمونه على وجه الإغماض، ثم لا يكفي ذلك حتى يسلموا لحكمه تسليمًا بانشراح صدر، وطمأنينة نفس، وانقياد بالظاهر والباطن، ... فالتحكيم في مقام الإسلام، وانتفاء الحرج في مقام الإيمان، والتسليم في مقام الإحسان، فمَن استكمل هذه المراتب وكملها، فقد استكمل مراتب الدين كلها**»(١).

**واتە: خوای گەورە سوێند بە نەفسی بەڕێزی خۆی دەخوات، ئیمان ناهێنن تاوەکوو پێغەمبەر ﷺ نەکەنە یەکلاکەرەوە لە نێوانتاندا، وە بەوەش تەواو نابێت تا بە سنگ کراوەیی و دڵنیایی نەفسی و پەیوەستبوونی بە ڕووکەش و ناوەڕۆکەوە نەبێت.**

**وەرگرتنی یاساکەی؛ ئەمە پلەی ئیسلامە، وە نەبوونی دوودڵی؛ ئەمە پلەی ئیمانە و خۆ بەدەستەوەدانی پلەی ئیحسانە، بەم شێوەیە هەموو پلەکانی ئیمان بەدەست دێنێت.**

**٣.** فەرمان دراوە بە جێبەجێکردنی هەموو جۆری فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ [الحشر: ٧].

قَالَ (السعدي) رحمه الله: «**هذا شامل لأصول الدين وفروعه، ظاهره وباطنه، وأن ما جاء به الرسول يتعين على العباد الأخذ به واتباعه، ولا تحل مخالفته، وأن نص الرسول على حكم الشيء كنص الله تعالى، لا رخصة لأحد ولا عذر له في تركه، ولا يجوز تقديم قول أحد على قوله**»(٢).

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص١٨٤، في تفسير سورة [النساء: آية: ٦٥].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٨٥٠، في تفسير سورة [الحشر: آية: ٧].

واته: ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی گەیاندن وەری بگرن، وە ئەوەی ڕێگری لێکردن کۆتایی پێبێنن.

ئەمە هەموو دین دەگرێتەوە، بە بنەما و پەلەکانەوە، دەبێت وەرگیرێت و پێچەوانەیەتی نەکرێت، دەقی پێغەمبەر ﷺ وەکوو دەقی خوا وایە، هیچ کەسێك پاساوی نییە لە جێبەجێنەکردنی و پێشخستنی قسەی بەسەریدا.

**٤.** مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران عليهم السلام گوێڕایەڵیکردنیانە.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ [النساء: ٦٤].

قَالَ (الْطَّبَرِيُّ) رحمه الله: «وَلَمْ نُرْسِلْ يَا مُحَمَّدُ رَسُولًا إِلَّا فَرَضْتُ طَاعَتَهُ عَلَى مَنْ أَرْسَلْتُهُ إِلَيْهِ، ... فَأَنْتَ يَا مُحَمَّدُ مِنَ الرُّسُلِ الَّذِينَ فَرَضْتُ طَاعَتَهُمْ عَلَى مَنْ أَرْسَلْتُهُ إِلَيْهِ»(١).

واته: ئەی (محمد ﷺ)؛ پێغەمبەرێکم نەناردووە مەگەر بۆ ئەوە نەبێت کە گوێڕایەڵی بکرێت لەلایەن ئەوانەی کە بۆیان نێردراوە، وە تۆش ئەی (محمد ﷺ) لەو پێغەمبەرانەی کە فەرمانم داوە بە گوێڕایەڵیکردنت لەلایەن ئەوانەی کە بۆیان نێردراوی.

**٥.** بەدەستهێنانی پلەکانی ئیمان پەیوەست کراوە بە شوێنکەوتەیی پێغەمبەرەوە ﷺ.

**أ. بۆ هیدایەتی خوایی:** قال الله تبارك وتعالى: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٨﴾ [الأعراف: ١٥٨].

واته: باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرەکەی بێنن، ... تاوەکوو هیدایەت وەرگرن.

**ب. بۆ بەزەیی خوایی:** قال تعالى: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٥٦﴾ [النور: ٥٦].

واته: گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بن، بەڵکوو بەزەیی خوا بتانگرێتەوە.

**ت. بۆ خۆشەویستی خوایی:** قال تعالى: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾ [آل عمران: ٣١].

---

(١) "تفسير الطبري" (٧/ ١٩٨)، في تفسير سورة [النساء: آية: ٦٤].

واتە: ئەگەر ئێوە بانگەوازی خۆشەویستی خوا دەکەن؛ شوێنکەوتەی من بن، ئەوا خۆشەویستی خوا دەبن.

**ث. بۆ باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژی دوایی:** قال تعالی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ [النساء: ٥٩].

واتە: ئەگەر دووبەرەکایەتییەك کەوتە نێوانتان، بیگێڕنەوە بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی، گەر باوەڕتان هەیە بە خوا و ڕۆژی دوایی.

**٦.** پێچەوانەیەتی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ گومڕاییە.

قال الله تبارك وتعالی: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾ [النساء: ١١٥]، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١٣﴾ [الأنفال: ١٣].

قَالَ (السعدي) رحمه الله: «أي: ومن يخالف الرسول صلى الله عليه وسلم ويعانده فيما جاء به ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ﴾ بالدلائل القرآنية والبراهين النبوية، ﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وسبيلهم هو طريقهم في عقائدهم وأعمالهم، ﴿نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ﴾ أي: نتركه وما اختاره لنفسه، ونخذله فلا نوفقه للخير، لكونه رأى الحق وعلمه وتركه»(١).

واتە: هەرکەسێك پێچەوانەیەتی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بکات و دژایەتی بکات؛ دەیخەینە سەر ئەو ڕێگایەی کە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە، لە ڕێڕەوی موسوڵمانان دەردەچێت، گومڕای دەکەن و هیدایەتی نادەن بۆ ڕێگەی ڕاست.

وقال تعالی: ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣﴾ [النور: ٦٣].

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٨٥٠، في تفسير سورة [الحشر: آية: ٧].

قَالَ (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ: «أَيْ: فَلْيَحْذَرْ وليخْشَ مَنْ خَالَفَ شَرِيعَةَ الرَّسُولِ بَاطِنًا أَوْ ظَاهِرًا، ﴿أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ أَيْ: فِي قُلُوبِهِمْ، مِنْ كُفْرٍ أَوْ نِفَاقٍ أَوْ بِدْعَةٍ، ﴿أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ أَيْ: فِي الدُّنْيَا»[١].

**واتە: ئاگادار بن و بترسن، ئەوانەی پێچەوانەی بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ دەبن تووشی بەلایەکی دووڕوویی و بێبڕوایی و بیدعەکاری و سزای سەخت بن.**

وقال تعالى: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ۝٣٦﴾ [الأحزاب: ٣٦].

**واتە: ئەوەی فەرمانی خوا و پێغەمبەر ﷺ بشکێنێت؛ ئەوا گومڕا دەبێت بە گومڕاییەکی ئاشکرا.**

وقال تعالى: ﴿قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٣٢﴾ [آل عمران: ٣٢].

**واتە: پێیان بڵێ گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بن، ئەگەر پشتی لێ هەڵکەن ئەوا خوای پەروەردگار بێبڕوایانی خۆش ناوێت.**

٧. فەرمان دراوە بە پێشنەخستنی ڕاوبۆچوونەکان.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ [الحجرات: ١].

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێناوە، پێش فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ مەکەون.**

وقال تعالى: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ [الأحزاب: ٣٦].

قَالَ (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ: «إِذَا حَكَمَ اللهُ وَرَسُولُهُ بِشَيْءٍ، فَلَيْسَ لِأَحَدٍ مُخَالَفَتُهُ وَلَا اخْتِيَارَ لِأَحَدٍ هَاهُنَا»[٢].

**واتە: ئەگەر یاسای خوا و پێغەمبەر ﷺ هات لەسەر کارێك؛ بۆ هیچ کەسێك لە پیاو و**

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٩٠)، في تفسير سورة [النور: آية: ٦٣].

(٢) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٣٧٧)، في تفسير سورة [الأحزاب: آية: ٣٦].

ئافرەتە ئیماندارەکان نییە ویست و هەڵبژاردنی خۆیان.

وقال تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٤﴾ [الأنفال: ٢٤].

واتە: ئیمانداران وەڵامی خوا و پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە بۆ کارێك کە مایەی ژیانەوەی ئێوەیە.

وقال تعالى: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥١﴾ [النور: ٥١].

قَالَ (ابن كثير) رَحِمَهُ اللهُ: «أَخْبَرَ تَعَالَى عَنْ صِفَةِ الْمُؤْمِنِينَ الْمُسْتَجِيبِينَ للهِ وَلِرَسُولِهِ، الَّذِينَ لَا يَبْغُونَ دِينًا سِوَى كِتَابِ اللهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ»(١).

واتە: خوای گەورە هەواڵ دەدات لەسەر سیفەتی ئیمانداران کە وەڵامی خوا دەدەنەوە، بەوەی هیچ دینێك بێجگە لە قورئان و فەرمووده نەبێت وەری نەگرن.

وقال تعالى: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ﴾ [الأحزاب: ٢١].

واتە: نموونەی بەقەدر و بەها هەیە لە شوێنکەوتەیی پێغەمبەردا ﷺ بۆ کەسێك مەبەستی ڕەزامەندی خوا و ڕۆژی کۆتایی بێت.

**٨.** تەنانەت داوای ئەوپەڕی مامەڵەکردن بە ڕێز و ئەدەبەوە کراوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ.

قال الله تبارك وتعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢﴾ [الحجرات: ٢].

قَالَ (السعدي) رَحِمَهُ اللهُ: «هذا متضمن للأدب، مع الله تعالى، ومع رسول الله صلى الله عليه وسلم، والتعظيم له، واحترامه، وإكرامه، فأمر الله عباده المؤمنين، بما يقتضيه الإيمان، بالله

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٦٨)، في تفسير سورة [النور: آية: ٥١].

